خه‌سڵه‌ت و ره‌وشته‌ كافیرخوازانی

# زانسته‌ شه‌رعیه‌كان



ئاماده‌كردنی



ته‌فسیر

هه‌ولێر - چاپی یه‌كه‌م ٢٠٠٢



خەسڵەت و رەوشتەکانی فێرخوازانی

# زانستە شەرعیەکان

خەسڵەت و رەوشتە کافیرخوازانی

# زانستە شەرعیەکان


ئامادەکردنی

یونس پیرداود باویانی



التفسیر

هەولێر

١٤٢٣ك-٢٠٠٣ز

ناوی کتێب: خەسڵەت و ڕەوشتەکانی فێرخوازانی زانستە شەرعیەکان
ئامادەکردنی: یونس پیرداود باویانی
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر
خەت: نەوزاد کۆیی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٣ك ٢٠٠٣ز
چاپکردن: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر
تیراژ: ١٥٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٨٤ ساڵی ٢٠٠٣

تفسير
هەولیر- شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

بسم الله الرحمن الرحيم

**پێشکەش بێ:**

١- بەو قوتابی و فێرخوازو فەقێ بەڕێزانەی، شەیدای زانست وزانیــارین و شەو و ڕۆژ دەخەنەسەر یەک بۆ پەیداکردنی زانیاری و خزمەت بــە پــەیامی شیرینی خواو پاشان بە میللەتە ستەمدیدە و بەش مەینەتییەکەیان .

٢- بەو خوێندکارە ئیسلامخواز و دڵسۆز و بەمشوور و بوێرو بە هەڵوێست و مـرۆڤ دۆسـت و خۆنەویسـت و خۆنـاس و خواناسـانەی، کـە بێجگـە لــە ڕێبازی پیرۆزی ئیسلام بە هیچ ڕێچکەو بیردۆزێکی مرۆڤکرد ڕازی نابن و بە نەشتەری ئیمان و زانست دەیانپووکێننــەوە و وەک بلقی سـەرئاو ئاسا تەماشایان دەکەن!

٣-بەهەموو موسڵمانێکی دڵسووتاو و بەپەرۆش بۆ پڕۆژەی بووژاندنەوەو گەشەپێدانی زانستە شەرعیەکان و وەرچەرخاندنی بــاری نالــەباری نــاوەند وسەنتەرەکانی زانستە شەرعیەکان بەرەو ئاسۆیەکی گەشترو بە هــێز و پێزتر و حاڵەتی ئاسایی خۆی .

## پێشەکی :

الحمد لله الذي علّم بالقلم ، علّم الانسان مالم يعلـم ، القائل في محكم كتابـه المبين ﴿فلولا نفر من كل فرقة طائفة ليتفقهوا في الديـــن ﴾ والصلاة والسلام على سيدنا محمدﷺ الرسول الأمين قائد غر الميامين القائل : ((من يرد الله بـه خيراً يفقه في الدين ))[1] وعلى آله وأصحابه ومن دعا بدعوته إلى يوم الدين.

وبعد :

گەر چاوێکی سادە و بە پەلە بە نێو لاپەڕە زێڕینەکانی مێژوو و فەرهـەنگ و کولتـووری نەتەوەکـەماندا بگـێڕین، دەبینـین بـە شـێوەیەکی زۆر زەق و بـەرچاو؛ ڕۆڵ و هـەوڵ و تێکۆشـان و مـاندوو بـوون و کاریگـەری ئەرێنـەیی خوێندنگاو قوتابخانە ئاینی یە ئەهلیەکان–حوجرە– کانمان بۆ بەرجەستەو دیـار و ئاشـکراو روون دەبـێ، کـەوا ئاسـتێکی یـەکجار بـەرزو مـەزن و پڕشنگداریان تۆمارکردووە لە مێژووی نەتەوەکەماندا پیشانداوە، ئـەویش بـە بینینی دەوری ڕابەرایەتی و چاو ساغی و پێشەنگی زۆربەی هەرە زۆری بوار و لایەنە جیاجیاکانی نێو کۆمەڵی کوردەواریمان، جابگرە هـەر لـە بەخشـین و پێشکەشکردنی: (هوشیاری ڕۆشـنبیری و زانسـتی و ئـایینی و ڕامیـاری و کۆمەلایـەتی)، تـا سـەر مەشـقیی و ڕابەرایـەتی بـزاڤ و جوڵانـەوە ئازادیخوازەکانی نەتەوەکەماندا.

هەروەها دەتوانین بڵێین سەنتەرێکی زانستی بەهێز و جۆش و خرۆشبوون لە هەمبەر بوژاندنەوەی پرۆژە(مشروع)ی ڕۆشـنبیرکردن و هۆشـیارکردنەوەی

---

١ - صحيح البخاري:١٢/٧٣، مسلم:١٠٣٧

میللیمان و پێگەیاندنی دەیەهاو سەدەها کەسایەتی کارامەو بە تواناو پسپۆڕ لە سەرجەم بوارە جیاجیاکاندا وەکو : ( زاناو ڕووناکبیرو شەرعزان و شاعیر و مێژوونووس و نووسەر و ئەدیب و پیاوانی ڕەمزی میللی و هتد.وەوە.

بە هەڵەدا نەچووین گەر بڵێین زۆرینەی مێژوو و کولتوورو فەرهەنگی گەلەکەمان لە حوجرەکاندا سەری هەڵداوە و سەرچاوەی گرتووە کە بەتەنها زەمەن و ساڵانێکی زۆر، تاکە مەڵبەندو سەنتەری زانستی و ئەکادیمی بوون.

حوجرەکان بەڵێ حوجرەکان سەرچاوەو چاوگەی یەکەمی پیرۆزی یە ئایینی و نەتەوەییەکەمانن و گشت لایەك قەرزاریانە !.

*خوێنەری بەڕێز و سەنگین:*

هەڵبەتە فەزڵی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم پەیامە شکۆدارەی، کە ناوەندەکانی زانستە شەرعیەکان هەڵیان گرتووە و کردوویانە بە مەشخەڵی ڕێیان، کە بریتی‌یە لە ئایینی بەرزو پیرۆزی ئیسلام، ئەم ئیسلامەی، کە هیچ لایەن و بوارێکی ژیانی مرۆڤایەتی پشت گوێ نەخستووە، بەڵکو یاساو سیستەم و ڕێگەچارەی گونجاوی بۆ تێکڕای بوارەکان دەست نیشان کردووە..

چونکە ئایینێکی سەرتاسەری و هەمەلایەن و گشتگیر و واقیع بینانەو زانستی‌یە لە گەڵ هەموو چاخ و سەردەم و کات و شوێن و هەلومەرجێك دا دەگونجێ و کۆکە !..

بۆیە بە تەنها بە کەلەپوور(تراث)ی هیچ نەتەوەیەك لەم جیهانەدا لە قەڵەم نادرێت، ئەم پەیامە خواییەی لەوەتەی دەست لەملان و ئاوێزانی گەلانی دونیا بووە جێ پەنجەکەی بەمانگی چواردە ئەچێ لە نێو تێکڕای گەلانی دونیاو گەلی بەش مەینەتی کوردمان بە تایبەت لە پێشکەشکردنی خزمەتی

جۆراو جۆر و هەمەچەشن و حاشا هەڵنەگر، دیسان ئەم توێژە قوتابیانی زانستە شەرعیەکان ڕۆڵێکی پۆزەتیف (إیجابي)یانەو بەرهەمدارو بەرچاویان گێڕاوە لە بونیاتنانی کۆمەڵگای کوردەواریماندا، کە هەردەم دەرچوانی ئەم ناوەندە –حوجرە– زاناو مامۆستایان دەوری پێشەوایەتی و ڕیش سپیاتی نێو کۆمەڵ و کۆمەڵگەکەمانیان بینیوە، لە ڕێی ئەوانەوە بە هۆی ئەوانەوە تێکڕای کێشەو گیروگرفتە کۆمەڵایەتیەکان بنەبڕو چارەسەرکراون..

هەروەها تاکەکانی کۆمەڵیان لە سەر خوو خەسڵەتی بەرزو بێ وێنەی (برایەتی و تەبایی و لێبوردەیی و هاوکاری و دڵسۆزی و...هتد)ەوە، پەروەردە کردووە و ڕاهێناوە و دووریان خستونەتەوە لە ڕەوشت و خەسڵەتی قێزەون و زیانبەخش و نەگریس! واتە هەم مامۆستاو هەم چاو ساغ و پێشەوای دین بوون، هەمیش هی ژین.

ئینجا بەندە وەك قوتابی و فێرخوازێکی ئەم ناوەندە زانستە شەرعیە، زەمەن و ماوەیەکە بیرۆکەی نووسینی نووسراوێکی وای لا گەڵاڵە بووە، کە بتواندرێ لە ڕێی ئەوەوە فێرخوازانی ناوەندەکانی– زانستە شەرعیەکان– ڕێنمایی و ئاراستەی پێویست و ڕێك و گونجاو بکرێن و تیایدا مەوقیعیەت و مەحەللی ئیعراب و کەسایەتی و خوو خەسڵەت و ڕەوشتی فێرخوازی نەلەخشاوو ڕەسەنیان بۆ شەرح و پێناس بکرێ بە مەرەمی سەر لە نوێ بونیاتنانەوەی کەسایەتی یان و پێشکەشکردنی خزمەتێکی بچووکیش بەم توێژە ڕەسەن و مەندە..

بەڵام ئەوەی ڕاستیبێ نەمان دەوێرا خۆمان لە قەرەی کارێکی وا سەخت و گەورە بدەین، حەزمان دەکرد و بەئاواتمان دەخواست ڕۆشنبیرێکی دەست ڕۆیشتو و بە توانا و قەڵەم بە دەست و پسپۆڕ لەم بوارەدا، بەم کارە

هەستابوایە، بەڵام دیاربوو پاش چاوەڕوانی زەمەنێك هیچ کامێك، خواستەکەی بەندەیان بەجێ نەهێناو بە مەقسەد نەگەیشتم!..

بۆیە بە ناچاری هەرچەندە خۆم بە شیاوی ئەم مەیدانە لە قەڵەم نادەم- عەزمم جەزم کرد و پێنووسەکەم گرتە دەست و دەستم کرد بە ئامادەکردنی ئەم نووسراوەی بەردەستت، بەو ئومێدەی توانیبێتم خزمەتێکم بەم بوارە کردبێت و خواست و ئارەزووی دۆست و دڵسۆزانیشم هێنابێتە دی و کەمێکیش لە قورسایی بەرپرسیاریەتی و ئەرکی سەرشانم سووك کردبێ و بەجێهێنابێ و شتێکم خستبێتە تای تەرازووی کردەوەکانم..

*لە کۆتاییدا:*

بەو پەڕی ڕاستگۆیی و نیاز پاکی و سینگ فراوانییەوە، داوا لە سەرجەم خوێنەرە دڵسۆزو بە ویژدانەکان دەکەم، کەوا هەر هەڵەو ناتەواوی و کەم و کوڕیەکیان بەرچاو کەوت و هەست پێکرد لە دەمی خوێندنەوەی ئەم نووسراوەدا بەندەی لێ ئاگادار بکەنەوە، چونکە ئەوەی بێ کەم و کوڕی یە تەنها خودای باڵادەست و توانایە.

والله الهادي إلى سواء السبيل وأسأله أن يجعل العمل خالصاً لوجهه، وأن يجعله طريقاً موصلاً إلى رضوانه..

**یونس پیرداود**

**سێشەممە (١٢)ی (جماد الثانية )ی ١٤٢٣ی کۆچی**

**بەرامبەر ٢٠ی (ئاب)ی ٢٠٠٢ی زایینی**

**کۆمەڵگەی باسرمە**

## ڕێ خۆشکردن:

خوێنەرە ئازیزەکان:

لە سەرەتادا بەندە بەنیازو مەبەستی وەرگێڕانی نامیلکەی (حلیة طالب العلم)ی نوسەرو زانای بەڕێز ( بکر بن عبد الله أبو زید )بوو، دەستی پێکرد، بەڵام دوایی بە پێویست و پەسندم زانی کەوا لە دووتوێی کتێبێکی سەربەخۆی ئاوادا بابەت و مەسەلەکان بەشێوازێکی فراوانترو زێدەتر بخەمەڕوو، بۆ نوسین سود لە بەرهەم وسەرچاوەکانی تریش وەربگرم بەمەبەستی بەهێز و پێزتر کردنی بابەتەکە .

ئینجا نێوەرۆکی ئەم نووسراوەی بەردەستت پێك هاتووە لەم حەوت بەشەی خوارەوە :

***بەشی یەکەم:*** چەند خەسڵەت و ڕەوشتێکی پێویست و پەیوەند دار بەخودی خوێندکار خراونەتە ڕوو، کە لە یازدە خاڵی جیا جیا پێك هاتووە. بەو مەبەستەی خوێندکار خۆیان لەسەر ڕابهێنن و بەرجەستەیان بکات لەخودی خۆی دا وکەسی شیاوی دوا ڕۆژی لێ دەربچێ .

***بەشی دووەم:*** لەم بەشەی دووەمەشدا چەند ڕەوشت و خەسڵەتێکی پەیوەند دار بەژیانە زانستی یەکەی قوتابی ـ زانستە شەرعیەکان ـ باسیان لێوەکراوە، کە نۆ خاڵی تایبەت بەم بوارەی بۆ دەست نیشانکراوە و تێدا باسکراوە.

***بەشی سێیەم:*** لەژێر ناونیشانی : ( بەکارهێنان و خۆ ڕازاندنەوە بە زانیاری (التحلی بالعلم)، کە لە پێنج خاڵ پێك هاتووە. هەڵبەتە خاڵی

سێیەمی چەند هەڵوێستێکی بوێرانەی هەندێ زاناو پێشەوای بە جەرگ و جوامێری تێدا خراوەتە ڕوو لەژێر ناونیشانی : ( عیززەت و سەربەرزی زانایان ) –عزة العلماء– .

*بەشی چوارەم :* لەم بەشەدا چەند ئەدەب و ڕەوشتێکی پەسندو پێویست باس کراون بۆ چاودێری وپاراستنی ڕێزی مامۆستا و فێرکار و چۆنیەتی هەڵسەوکەوت لە گەڵی دا ، دوایش چەند ڕێنماییەکی گرینگ خراونەتە ڕوو .

**بەشی پێنجەم** : ئەم بەشەش تایبەتە بە بواری چۆنیەتی هەڵسوکەوتی قوتابی ـ زانستە شەرعیەکان ـ لە نێو قوتابخانەدا، کە لە هەشت (٨) خاڵی تێرو تەسەل خۆی دەنوێنێ، کە زۆرێك لە ئاداب و ڕەوشتەکانی وەك : میوانداری و خواردن و خواردنەوە و خەوتن و هەستان لەخەو و ئیزن و مۆڵەت وەرگرتن و پژمین و باوێشك و قسەکردن و ...هتد لە خۆ گرتووە.

**بەشی شەشەم** : ئەمەشیان تەرخان کراوە بۆ بەراورد کردنێکی زانستی لەنێوان زانست و زانیاری و سامان و دارایی ، کە لە سێزدە (١٣) خاڵی بایەخدار پێك هاتووە .

**بەشی حەوتەم** : کەدوا هەمین بەشی ئەم نووسراوەی بەردەستتە هەندێ ئاگاداری و وریا کردنەوەی پێویست و گرینگی تێدا خراوەتە ڕوو بەمەبەستی بەرچاو ڕوونی فێرخوازی ـ زانستە شەرعیەکان ـ کە لە حەوت خاڵی پێویست پێك هاتووە و باسی لێوە کراوە .

ئینجا لە پاش خستنە ڕووی ئەم ڕێ خۆشکردنە، داواکارم لە خوای بە بەزەیی و میهرەبان، ئەم نووسراوە بکاتە هۆکارێکی ئیجابی بۆ پێشڤەچوونی ئاستی زانیاری ـ ناوەندەکانی– زانستە شەرعیەکان– و بەرچاو ڕوونی و هۆشیاری بەسودو بەرچاو بۆ فێرخوازانی ئەم نێوەندە و چاکتر و باشتر

حاڵی بوون و لەخۆدا کردە حاڵ و هاتنەوە سەر ڕاستە هێــڵی خودایی ئـەم توێژە ڕەسەن و بەڕێزە، کە بێگومان ئەمــەش بـە هــەوڵ و تەقـەلا و جوهـدو ماندوبوون و شەونخونیەکی زێدە و فرە بەدەست دەهێنــدرێ وەك گوتویانـە: (من جدّ وجد).

هـەروەها دڵسۆزی و دەستبار بۆ یەکگرتنـەوە و برایــەتی و هاوکــاری و تـەواوی نێـوان ئـەهلی زانست چ وەك فێرکـارو مامۆســتا چ وەك فــێرخواز و قوتابی گەرەکە.

بێگومان گەر سەرنجی بەسەرهات و قسە و گوفتـاری زانایـانی پێشـینیش دە دەین دەبینین لەڕێگا و پێناوی پەیدا کردنــی زانیـاری دا جۆرەهـا ئـازار و زەحمەتی و دەردی سەریان بینیوە بۆ نموونە :

(ابـن عبـد الـبر) ڕەجمـەتی خـوای لێبێـت ـ لـە پێشـەوا (مـالك) رحمــه الله دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: (( إنّ هذا الأمر لن يُـنال حتـى يَذاق فيـه طعـم الفقر ، وذكر مانزل بربيعة من الفقر في طلب العلم حتى باع خشب سقف بيته في طلب العلم ، وحتى كان يأكل ما يُلقي على مزابل المدينة مـن الزبيـب وعصـارة التمر)).[١]

واتـە: ئـەم کـارە ـ پـەیدا کردنـی زانیـاری ـ تالـەپێناوی دا تـامی هــەژاری نەچێژی پــێی ناگـەی ، پاشـان باسـی ( ڕەبیعـە)ی کـرد، کـە لـەم پێنـاوەدا دووچاری چ هەژارییەك هاتووە، بـە شـێوەیەك ناچـاری فرۆشـتنی دارەکـانی سەربانی خانووەکەی و خواردنی خۆراکە فـڕێ دراوەکـانی سـەر زبڵدانـەکانی شار بووە ! .

بە (شەعبی)یان گوت: من أين لك هذا العلم كله ؟ ئـەم هـەموو زانیـارییەت چۆن پەیدا کردووە ؟ لەوەلامدا گوتـی: ((بنفـي الإعتمـاد ، والسـير في البـلاد ،

١ - الجامع في طلب العلم الشريف/ ص ١٥٨س ( جامع بيان العلم )ج١/ص٩٧.

وصبر كصبر الحمار ، وبكور كبكـور الغراب))[1] واتـه: بـەهۆی پاڵنەدانـەوە و گەڕان بەوڵاتان و ئارامگرتن وخۆراگری یەك وەك ئارامگرتن و خۆڕاگـری گـوێ درێژ و ، زووهەستان و وەخۆكەوتنی بەیانیان وەك هی قەڵەڕەشە !.

پێشینانیش زۆر ڕاستیان گوتـووە، کـە دەڵێـن ((العلـم لا يُعطيـك بعضَـهُ ، حتى تعطيه كُلكَ)) .

ربنا تقبل منا إنك أنت السميع العليم ، وتب علينا إنك أنت التواب الرحيم

والله الموفق إنه على كل شيء قدير

---

١ - الرحلة في طلب الحديث/ص١٩٦و (الجامع في طلب العلم الشـريف) ص/١٨٠ بەلام لـە (الجامع) دا لـە حياتي وشەی (الحمار) وشەی (الجماد) هاتووە.

# بەشی یەکەم

## چەند خەسلەت و ڕەوشتێکی پەیوەندی دار بە خودی خوێندکار

لەسەرەتادا بەر لەوەی دەست بکەین بە هەژمارکردنی ئەو خەسلەت و ڕەوشتانەی، کەپەیوندی دارن بە خودی خوێندکارانی زانستە شەرعیەکان ، پێویستە خوێندکار ـ فەقێ ـ ئەم ڕاستی یە چاك بزانێ، کەوا تاکێکی وەکو ئەو، کە ئامانجی بە دەست هێنانی زانستە شەرعیەکانی لا گەلالە بووە، بۆ ئەوەی لە دوارۆژێکی نزیك دا کۆمەلگەو دەوروبەری کەلکی لێ ببینن و گۆڕانکاری بخولقێنێ. هەلبەتە ئەمە کارێکی واسادە و سانانیە، بەلکو شەونخونی و شەکەتی ئەوێ، بۆیە کۆمەلە ڕەوشت و خەسلەتێکی گرینگ هەن، کە لەواقیعدا وەك بنەماکانی پێگەیشتنی خوێندکار تەماشا دەکرێن و حسابیان بۆ دەکرێ، زەرورە خۆی لە سەریان ڕابهێنێ و جێ بەجێیان بکات ، کەلەخوارەوە ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین وەك :-

### ١- زانست بەخوا پەرستی دانان:

بەلێ لە تێگەیشتنی ئیسلامی دا، بەپێی دەقە شەرعیەکان لە قورئان و سوننەتدا ، زانست وزانستخوازی خواپەرستی‌یەو بەمەش لە قەلەم ئەدرێ ، تا ئاستێکی وابەشێك لە زانایان فەرموویانە (العلم صلاة السر وعبادة القلب)[1] واتە: زانیاری نوێژی نهێنی‌یەو خواپەرستی دلە، جابێگومان لە سەر ئەو ئەساسەی کەوا دەلێین ـ زانست خواپەرستی‌یە ـ پێویستە بزانین، کە خواپەرستی(العبادة)ش مەرجی تایبەتی خۆی هەن، بۆنموونە:-

---

١ -حلية طالب العلم .ص٦

أ- بەس خودا مەبەست بوون ( الاخلاص ) :

یەکەمین وبنەڕەترین مەرجی خواپەرستی ( نیەت پاکی )یە کەواتــە دەبێ سـەرەتا بەرلـەوەی دەست بـەکاربی لـە بەدەسـت هێنـانی زانسـت ( العلـم ) پێویسـتە قوتـابی ـ فـەقێ ـ دڵـی خـۆی بـۆ خـوا یـەکلا بکاتـەوە و تەنـها ڕەزامەندی خودای مەبەست بێ، چونکە ئەگەر ـ خوانەخواستە ـ بەو شێوەیە نەبێت، وەکو کورد گوتەنی : (دەبێت بە سـەپانی پووشـێ و لـە مـاندووبوون بەولاوە هیچی تری پێ نابڕێ) زانستەکەیش لە بری سـودگەیاندن زیانبـەخش دەبێت ـ پەنا بەخوا ـ خوای زاناش لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ فـاعبد الله مخلصـا لـه الدیـن...﴾[1] واتـە : خـودا بپەرسـتە و بەندایـەتی خۆتـی بـۆ یەکلابکەوە.. کەوابێ بەس خودا مەبەست بـوون، لـە هـەر ئیش و کـارێك دا، مـەرجی بنـەڕەتی و دروسـت بـوون و وەرگـیرانی ئـەو کارەیـە. پێغەمبـەری پێشەواش ﷺ فەرموویەتی: (( إنما الإعمال بالنیات وإنما لکل إمرء ما نـوی))[2] واتـە: بێگومـان وەرگـیران و وەرنـەگیرانی، هـەموو کردەوەیـەکی بـاش بـەس بـەگوێرەی نیـازو مەبەسـتە، بێگومـان هـەموو مرۆڤێکیـش بـەپێی نیـازو مەبەستی حسابی لە گەڵ دەکرێ .

ب - پێکان و بەپێی شەرع بوون ( الصواب ) :

تاکە خەسڵەتێك، کە چاکەو خێری دونیا و دواڕۆژ بەرهـەم بهێنێ، بریتیـە لـە (خۆشویسـتنی خـودا و پێغەمبـەر ﷺ، ئەمەشیان تەنـها بـە شـوێن پـێ هـەڵگرتنی و گرتـنی خـەت و ڕێبـازی پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ بەدەسـت دەهێندرێ، وەك لەم بارەیەوە خوای کارزان ئەفەرمووێ: ﴿ قـل إن کنتـم

---

١ -الزمر /٢

٢ - متفق علیه: البخاری : ١، ٦٦٨٩، مسلم ١٩٠٧

تحبون الله فاتبعوني يحببكم الله، ويغفر لكم ذنوبكم﴾[1] واته: پێیـان بڵـێ: ئـەی محمد ﷺ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن خواتان خۆش دەوێـت، شـوێن پـێی مـن هەڵگرن و شوێنم بکەون، ئینجا خوا ﷻ ئێـوەی خـۆش دەوێـت و لـە گونـاهو سـەرپێچیەکانتان دەبـوورێ . بـەڵێ بۆیـە پێویسـتە خوێندکـاری زانسـتە شەرعیەکان، سەرەڕای نیازپاکی و بەس خوا مەبەسـت بـوون لـە کارەکـەیدا، مەرجە شـەرعیش بەم زانستە ڕازی بێ وبـەپێی ڕەزامـەندی شـەرع و لـە ژێـر چاودێری ئەودا بێت، لە گەڵ شەرعدا ناکۆکی و تێك گیران ڕوونەدا.

**٢-ترسان لە خوا ﷻ :**

خوێنەری بەڕێز :

یـەکی دیکـە لـەو خەسـڵەتە بەرزانـەی فـێرخوازی ـ زانسـتە شـەرعیەکان ـ بریتیە لە ـ لەخوا ترسان ـ واتە : دەبێ بەو پەڕی دڵسـۆزی یـەوە ، هـەوڵدات بۆ ئاوەدان کردنەوەی دەروودەروون ـ الظاهر و الباطن ـ ی بە ترسان لە خوای باڵا دەست، چونکە بێگومـان ـ ترسـان ـ قـامچی خوایە بـەندەکانی بە هـۆی ئەوەوە ئەخاتە سەر ڕێبازی و ڕاستە شەقامی زانیاری و کردار، تاکو ببێت بە هۆکارێکی کاریگەر بۆ لەخوانزیك بوونەوە و وەرچەرخان بەرەو خوا ..

دەتوانیین بڵێین: ترس ـ الخـوف ـ بریتیەلـە: سـوتان و ژانـی دڵ بـە هـۆی ئەنجام دانـی کـارێکی ناپەسند و خـراپ، بەرامبـەر زاتـی بەرز و باڵادەسـتی خواﷻ. هەروەها هۆکارێکی گرینگیشـە بـۆ ڕاهێنـانی سـەرجەم ئەندامـەکانی لەش لەسـەر دوورکەوتنـەوە لـە تـاوان و پەیوەسـت بـوون بـەخوا پەرسـتی و گوێڕایەڵی...

---

١ -آل عمران/٣١

خوای مەزنیش دەفەرمووێ : ﴿ إنما يخشى الله من عبـــاده العلمـــاءُ ﴾[1]
جابێگومان، هەر شتێك گەورەیی زانیاری بگەیێنێ، بەهەمان شێوە گـەورەیی
- ترسان لە خواش - دەگەیێنێ ، چونکە - ترسان - بەرهەمی زانستە...

بۆیە پێشەوا ( ئەحمد ) رەحمەتی خـوای لێبێـت - دەفـەرمووێ: بنچینـەو بنەڕەتی زانست لە خوا ترسـانە، کەواتـە پەیوەسـت بـە بـە لەخواترسـان لـە هەردوو حاڵەتی نهێنی و ئاشـکرا، چونکـە باشـترین مـرۆڤ کەسـێکە لـە خـوا بترسێ ، هەڵبەتــە لـە خـواش ناترسێ مەگـەر زانـا نـەبێت، کەواتـە باشـترین مرۆڤ مرۆڤی زانایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زانا بەزانا لەقەڵەم نادرێت، مەگەر کار بەزانستی بکات واتە - عامل - بێت ، زاناش کار بەزانستی ناکات مەگەر لە خوا بترسێ.[2]

خوێندکاری ئازیز :

بەڵام ئەبێ ئەم ڕاستیەش بزانـین، کـە ترسـان لـەخوا(الخـوف مـن الله)ش، پلەو ئاستی خۆی هەن، کە هەرگیز نابێ تێکەڵ بە یەکتر بکرێن، بۆ نموونە:

**أ– کورتە ترس . الخوف القاصر .**

کـە جۆرێکـە مـرۆڤ دوچـاری بـێ ئاگـایی - الغفلــة - دەکـات ، دەروونـی سەرکەشیش پێ قەدەغە و ڕێشمە ناکرێ لە تاوان کردن .

**ب – زێدە ڕۆیی لەترس - الإفراط في الخوف - :**

زێـدە ڕۆیـی کـردن لـە - تـرس - مـرۆڤ ئەخاتـە حالـەتی بێ هیوایـی وبـێ ئومێدی .

---

١ - فاطر ٢٨

٢ -حلية طالب العلم ص٩

**ج -ترسانی مام ناوەندی:**

بێگومان ئەم جۆرەیان باشترین و گونجاو ترین پلەو جۆری ترسە.

جابەڕێزان:

تاکی لە خوا ترسیش کەسێکی وا سادەو سەرکێل نیە، کەوا بەشێوەیەك لە چەمکی - لەخواترسان - حاڵی بێ، کە تەنها بریتیە لە: گریان و فرمێسك سڕین و بەس، بەڵکو چاك بەڵەدەو دەزانێ کەترسانی ڕاستەقینە بریتیە لە دەست هەڵگرتن و پشت کردن لەم کارو کردارانەی، کە مرۆڤ لە سەرئەنجامدانیان دووچاری سزادان دەبێت .

هەندێ لەزانایانیش بەم شێوەیە دەربارەی - لەخواترسان - دواون، کە دەڵێن ((ئەگەر کەسێك لە شتێك بترسێ لەبەری ڕائەکاو هەڵدێت، بەڵام بە پێچەوانەوە کە کەسێك لە خوا دەترسێ بۆ لای خوا ڕائەکاو بەرەو لای دەگەڕێتەوە))[1] !! .

### ٣- هەست کردن بەچاودێری خوا ﷻ :

خەسڵەت و ڕەوشتێکی تری - قوتابی زانستە شەرعیەکان - بریتیە لەوەی، کە هەردەم لە هەموو کات و شوێنێك دا هەست بە چاودێری - المراقبة - ئاگاداربوونی خوا دەکات و دڵنیایەو دەزانێ، کە هیچ شتێك لێی وون نابێ، شەوی تاریك و ڕۆژی ڕووناك، لای خوا یەکسانە هەست بەسیلەی چاوو خورپەی دڵ دەکات، هیچی لێ نادیار نیە، تەنانەت دەنگی پێی مێرووش، هەروەك لەم بارەیەوە دەفەرمووێ : ﴿ وما يخفى على الله من شيء في الأرض ولا في السماء﴾[2] واتە: هیچ شتێك لە خوا ون نابێ ، نەلەزەوی و نەلە ئاسماندا .

---

١ البحر الرائق في الزهد والرقائق/ص٢٢٠

٢ -ابراهيم/ ٣٨

هەروەها پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ فەرموویەتی: ((اتــقِ اللّٰه حَيْثُمــا كنتَ))[1] واتە: لە هەر شوێن و كات و حاڵە تێكدا ، لە خوا بترسەو پــارێز لـە خوا بكە .

## ٤ـ دونیا بەكەم سەیر كردن ـ الزهد ـ :

دونیا كردن بە ئامانج و خۆشویستنی ژیانی دونیـا و هـەڵبژاردنی بـە سـەر ژیانی دوا ڕۆژدا، سیما و خەسڵەتێكە لــەو خەسـڵەتە بـەدو نەگریسـانەی، كـە كـافر و خوانـەناس و سـتەم كـاران پێیـەوە دەناسـرێن، بـە درێژایـی مێـژووی مرۆڤایـەتی خەسـڵەتێكی زەقــی ئــەوان بــووە، وەك خــوای كـــار لـــەجێ دەفەرموێت:﴿ ویل للكافرین من عـــذاب شدید الذین یستحبون الحیاة الدنیا علی الأخرة ﴾[2] واتە: هاوار بۆ بێ باوەڕان لە سزاو ئازارێكی توند، ئەوانەی، كە ژیانی دونیا بەسەردواڕۆژدا هەڵدەبژێرن .

بەڵام بێگومان، خوێندكاری زانستە شەرعیەكان، نەك تەنها ئەم خەسـڵەتە لەخۆی ناوەشێنێتەوە، بـەڵكو هـەوڵی ڕیشـەكێش كـردن و لـە نێـو بردنیشـی دەدات، تاكو كۆمەڵگەو كەسانی گیرۆدە بوو پێی پاك و خاوێن بكاتەوە لـەم جۆرە خەسڵەتە ڤایرۆس ئاساو زیانبەخشانە تێدەكۆشـێ و ڕەنـج دەدات، بۆ ئەوەی لە شوێنیا خەسڵەتی – دونیا بەكـەم گرتـن ـ بڕوێنـێ و بـەرقرار بكـا، چونكە ژیان وگوزەرانی دونیا لە هزرو تێگەیشتنی ئەو، شتێكی كەمــەو تەنـها وەسیلە وكێڵگەیەكە بۆ دواڕۆژ، چونكە خۆی بـە خوێندكـارو فـێرخوازی ئـەم قوتابخانەیە دەزانێ، كـە مامۆسـتاكەی پێغەمبـەری پێشـەوا ﷺ دەربـارەی ـ ژیانی دونیا ـ بەم شێوەیە دەدوێ و دەفەرمووێ: ((ما الدنیا في الأخـــــرة إلا

---

١ – حسن الترمذی: ١٩٧٨

٢ –ابراهیم/٢-٣

مثلُ مايَجعلُ أحَدُكُم أصبَعَهُ في اليم فَلْيَنظُر بِمَ يَرْجِعُ!؟)).[1] واتە: وێنەی دونیا لەچاو دواڕۆژ تەنها وەك ئەوە وایە، کەیەکێکتان پەنجەی دەخاتە ناو دەریاوە، جا سەرنج بدات داخوا چ بە پەنجەیەوە دێ ·

ئینجا خوێندکار و فەقێی وریا: توخوا ژیانێك ئەمە ماهیەتی بێت چۆن مرۆڤی ژیر ئەیکات بە ئامانج و ڕەنجی بێ سنووری بۆ ئەکێشێ و تەمەنی کورتی لە پێناوی دا خەسار دەکات ؟! بێگومان ـ دونیا بەکەم گرتن ـ یش لە زۆر ڕوو لایەنەوە بە دەردەکەوێ بۆ نموونە :

أـ لایەنی خواردن و خواردنەوە: واتە: لەم لایەنەوە زێدەڕۆیی نەکات و زۆر بەتەنگ وورگەوە نەبێت و نەوسن و ئارەزوو پەرست نەبێت ·

ب ـ سەرقاڵ نەبوون و زیاتر لە پێویست خۆخەریك نەکردن بە کۆکردنەوە و خستنە سەریەکی پارەو سامان، واتە: قەناعەتی هەبێ و بەرچاوتێربێ ·

ج ـ لایەنی جل و بەرگ وپۆشاك : بەشێوەیەك خەریکی مۆدیلات و پۆشاکی زۆر بە نرخ نەبێت بە جل وبەرگی سادە و کەم نرخیش رازی بێت ·

د ـ لایەنی ناو و شۆرەت : واتە: گوێ بەمەدح و بەشان و باڵ هەڵگوتنی خەڵکیەوە نەدات و دووربێ لە خەسڵەتی خۆ بەدەرخستن.

هـ ـ شێوەی خوڕەوشت و هەڵس وکەوت لە گەڵ دەوروبەردا : بە جۆرێك کەوا نموونەی مرۆڤێکی نەرم ونیان وبێ فیزو خۆنەویست و گوفتارشیرین ئاکار بەرز بێت لە نێو کۆمەڵدا.

خوێنەری سەنگین وفەقێی لەدڵا شیرین :

خەسڵەتی ـ دونیا بە کەمگرتن ـ بە درێژایی مێژوو دەوری کاریگەر و بێ وێنەی بینیوە، لەپێگەیاندنی دەیەهاو سەدەها زانا و بلیمەتی خواناس و ناودار وبێدار، چونکە وەك هۆکارێکی کاریگەرو بایەخداریان تەماشا کردووە،

---

١ – صحيح: مسلم · ٢٨٥٨

بۆ بڕینی سەرجەم قۆناغ و پلەکانی ساڵح بوون و بەرەو خوا چوون

بۆ نموونە : یەحیای کوڕی یەحیا، کە ئیمامی مالك، وەك ڕێزلێ نانێك نازناوی (عاقل أهل الأندلس)ی لێناوە، کە یەکێك بووە لەو خوێندکارانەی لە تەمەنی منداڵیەوە لە خزمەت ئیمامی خوێندووە، بە هۆی زیرەکی و ژیری ولێهاتووییەوە جێی سەرسوڕمانی. بووە، دەگێڕنەوە ڕۆژێکیان قوتابی ناوبراو - هاوڕێ لە گەڵ چەند قوتابیەکی ترەوە سەرقاڵی دەرس خوێندن دەبن لە خزمەت ئیمام، یەکێك لە هاوەڵانی دەڵێت: ئا ئەوەیان فیلە، هاوەڵانی بە پەلە خۆیان کردە دەرەوە بۆ تەماشاکردنی فیلەکە، بەتەنها یحیی لە گەڵ ئیمام مایەوەو خۆی تێك نەدا، بۆیە ئیمام پرسیاری لێدەکات لەهۆی نەچوونە دەرەوەی وەك باقی هاوەڵانی، بۆ تەماشا کردنی فیل -، کە لەو کات لە وڵاتی ئەندەلوس نەبوو یان کەم بوو ناوبراو لە وەڵامی ئیمام دا گوتی: مامۆستا من کە لە نیشتمان و وڵاتی خۆم هاتووم بۆ ئێرە ژیانی غەریبیم هەڵبژاردووە بەو نیازەی زانست و زانیاریت لێوە فێربم، نەك بۆ تەماشاکردنی فیل. بۆیە دوای ئەوەی ئیمام ئەم جۆرە هەڵویستانەی لێ بیستن نازناوی عاقل اهل الأندلس ی پێ بەخشی!؟..

جا بەڕێزان : بێگومان تەماشاکردن و سەیرکردنی گیانلەبەری سەیرو نامۆ کارێکی موباحە.. بەڵام کاتی قوتابی فەقێ زۆر لەوە کەمترە، کە خۆی سەرقاڵ و خەریك بکات بە کارێکی وا، ئەگەر چی لە ڕیزی کارە موباحەکانیش بێت .

## ٥- خۆ بە کەم گرتن و بێ فیزی :

یەکی دیکە لەو خەسڵەت و ڕەوشتانەی، پێویستە خوێندکاری زانستە شەرعیەکان، خۆی لەگەڵیا ڕا بهێنی و بیکات بە واقعێك لە ژیانیدا، بریتیەلە: ( خۆ بە کەمگرتن ) و دوورەپەرێز بوون لە لووت بەرزی و فیز و شانازی

کردن بە سەر خەڵکییەوە، چونکە ئەم سیفەت و ڕەوشتانە سەرەڕای ئەوەی تاوانن و مرۆڤ پێیان گوناهبار ئەبێ لە لایەن خواوە، هاوکات کەسایەتی قوتابیش دەشێوێنێ و لەکەدار دەکات، هەڵبەتە کارێکیشە لەگەڵ ڕەوشتی هەڵگرانی – زانستە شەرعیەکان – هەڵ ناکا و تێک ناکاتەوە، چونکە بێگومان هەڵگری ناسنامەی – زانستە شەرعیەکان – دەبێ تابڵێی مرۆڤێکی ڕووخۆش و بە پەرۆش و کردارو گوفتار شیرین و ئارامگرو مل کەچ و حەق و ڕاستی قبوڵ کارو ڕاستگۆ و بێفیز بێت لەگەڵ هەموو چین و توێژەکانی نێو کۆمەڵ بەتایبەنی هاوەڵ و نزیکانی.

ئینجا خوێندکاری ئازیز :

سەرنج بدەو بزانە، پێشینانی ئەم ئوممەتە ئیسلامیە چۆن چۆنی و بە چ شێوەیەك خۆیان لە خەسڵەتە بەدو خراپەکانی وەك : شانازی و فیز بەسەر خەڵکەوە کردن بەدوور گرتووە ..

بۆ نموونە: پێشەوا –الذهبی– لەباسی –عەمری کوری ئەسوەدی عەنسی–دا کە لە سەردەمی خیلافەتی – عبدالملکی کوڕی مەروان – وەفاتی کردووە (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ : عەمر کە لە مزگەوت دەهاتە دەرەوە، دەستی ڕاستی دەخستە سەر دەستی چەپی، جا لەهۆی ئەنجامدانی ئەم کارەیان لێ پرسی؟ لە وەڵامدا فەرمووی: لە ترسی دووڕوویی کردنی دەستەکانم وا دەکەم![1]

بەڵێ خوێنەری بەڕێز :

خوێندکاری زانست و شەرع دۆست، دەبێ بەم شێوە پاکە خۆی رابهێنێ، نابێ بە هیچ شێوەیەك تەفرە بە برە زانستەکەی –یاخود هەر جۆرە بەهرەیەکی تری خوا پێداو – بخوات و غروری بیگرێت و بەم هۆیەوە لووت

---

١ –حلية طالب العلم/ ص–١٠

بەرزی و خۆبەگەورەگری (التكبر) بنوێنی لە گەڵ دەوروبەری و کەسانی بەرامبەریدا.

ڕاستییەك:

بێگومان هەرخوێندكار–فەقێ–یەك ڕەوشتی خۆ بەگەورە زانینی هەبوو واتە (متكبر) بێت مەحاڵە بتوانێت بە پێی پێویست زانیاری بە دەست بهێنێ و لێی بەهرەمەند بێت، چونكە لە ناخی خۆیدا كەسایەتی خۆی لە خەڵكی تر بە زاناترو تەواو كامل تر و لێوەشاوەو بە تواناتر تەماشا دەكات و هەڵدەسەنگێنێت، هەڵبەتە ئەمەش كۆسپێكی ڕێگرە لەبەردەم پێشڤەچوونی توانا زانستییەكەی.

پێغەمبەری خواﷺ دەربارەی خۆبەگەورەزان و لوت بەرز فەرمویەتی: ((لا يدخل الجنة من كان في قلبه مثقال ذرة من كبر..)) كەسێك ناچێتە بەهەشت، كە بە ئەندازەی گەردیلەیەك خۆبەگەورەزانی لەدڵ دا بێت.

## ٦- بە ئارامی و خۆڕاگری:

ڕەوشت و خەسڵەتێكی تری قوتابی – زانستە شەرعیەكان– كە پێویست وایە خۆی لە سەری پەروەردە بكات و لە هەڵس و كەوتی ڕۆژانەی دا ڕەنگ بداتەوە، بریتییە لە (بە ئارامی و خۆڕاگری) دیارە بێگومان ئەم ڕەوشتەش كاریگەریەكی بێ وێنە لەسەر ژیانی قوتابی هەیە، بۆیە هەڵگرتنی وەك خەسڵەتێك و بە ئەنجام گەیاندنی پاداشی بێژمارەی پێوەیە لای خواﷻ هەر وەك دەفەرمووێ ﴿ إنما يوفَّى الصابرون أجرهم بغير حساب ﴾[1] لەمەش زیاتر پەروەردگار هەواڵی موژدە بەخشی (لە گەڵ بوون) المعية–مان بە گوێدا ئەچرپێنێ و دەفەرمووێ: ﴿ واصبروا إن الله مع الصابرين ﴾[2] ئینجا

---

١ – الزمر: ١٠

٢ – الأنفال: ٤٦

ئارامگرتن و بە ئارامی (الصبر) وەك ( راغب الأصفهاني ) دەڵێ: بریتییە لە دەرفەت نەدان و جڵەوگیرکردنی دەروون (النفس) لە سەر هەر شتێك، کە پێی ناخۆشە –حبس النفس عما تکره– یاخود بەم شێوەیە پێناس کراوە، کە دەڵێ: قوت دانی تاڵی و سوێریەکانی ژیانە بەبێ دەربڕینی ڕووگرژی و نارەزایی (تجرع المرارة من غیر تعبس)[1] ئینجا پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبی تالیب– رەزای خوای لێ بێت–) ئارامگرتن دابەش دەکات بۆ ئەم سێ بەشانەی خوارەوە:–

ئارامگرتن لەسەر فەرمانبەری خوا ( صبر علی الطاعة).

٢–ئارامگرتن لە سەر بەڵاو گیر و گرفت و ناخۆشی (صبر علی المصیبة).

٣–ئارامگرتن بەرامبەر ئەنجامدانی خراپەو تاوان(صبر عن المعصیة): بەهۆی بەرهەڵستیکردنی دەروون و خۆبەدەستەوەنەدانی.[2]

کەواتە: برای فێرخواز و فەقێی شیرین، هەڵبەتە تۆ بە ئومێدی هەڵگرتن و بەرز ڕاگرتنی بەیداخی زانستە شەرعیەکان و پێشەنگ و سەرقافڵایەتی کردنی خەڵکی و چاکسازی و ڕاستکردنەوەی کۆمەڵ و ئاشناکردنیان بە پەیامی خواو پاشان بەرقەرارکردنی لە واقیعی کۆمەڵگە و سەرجەم بوارەکانی ژیان دا پێت ناوەتە گۆڕەپانی کارو لاف و گەزافی ئەمانەو جاری وایە زیاد لەمانەش لێ دەدەیت! بێگومان دەبێت، تا بڵێی مرۆڤێکی بە ئارام و خۆڕاگر و پشوو درێژ و سەلیقەدار بیت، ئینجا دەتوانیت بە ئامانج بگەیت و سەرکەوتوو بیت چونکە ( من ثبت نبت).

پێشەوا (مالك)یش–خوا لێی رازی بێت– بەم شێوەیە ئامۆژگاری قوتابیەکانی دەکرد و پەروەردەی دەکردن، کە دەفەرمووێ: ((حقاً علی من

---

١ –البحر الرائق في الزهد والرقائق ص١٩٨

٢ – الخطایا في نظر الإسلام.

طلبَ العلم ان يكون فيه وقـار وسـكينة ، وأن يكـون متبعـاً لأثـار مـن قضـى و ينبغي لأهل العلم ان يخلوا انفسهم من المذاح وبخِاصـةٍ اذا ذكـروا العلـم)) واتـه :پێویسته لەسەر قوتابی زانستخواز وا بە ویقار و بە ئارام و لە خواترس بێت، هەروەها شوێن بەرهەم و شوێنەوارو کەلەپووری پێشـینانی ڕەسـەن بکـەوێ، وە پێویسته زانایان خۆیان بپـارێزن و دوور بگـرن لـە قسـەو گوفتـاری گاڵتـە ئامێز، بە تایبەت لەکاتی باس کردنی زانیاریدا .

### ٧- نەرم و نیانی ( الرفق ) :

خەسـڵەتی ( نـەرم و نیـانی ) یەکێکـە لـەو ڕەوشـتە پەسـندانەی، کـە خوێندکـاری – زانسـتە شـەرعیەکان – بـە زەرورەتێکـی ژیـانی دەزانـێ و بەهەندی هەڵدەگرێ، بە هۆکارێکی بنەڕەتی دەزانێ لە بە ئـەنجام گـەیاندن و بەرهـەمداربوونی هـەر کـارێکیدا، چونکە نـەرم و نیـانی و سـینگ فراوانـی ڕەوشت و سیمایەکی زەقی پێغەمبەری پێشەواﷺ وهاوەڵە بەڕێزەکانی بووە، بۆ نموونە: دەبینـین لـە چـەندین فـەرمووده، پێغەمبـەری ئـازیز ﷺ ئامـاژەی پێـداوەو بـە شـێوەی ئامۆژگـاری ئاراسـتەی موسـڵمانانی کـردووە، وەك دەفەرمووێ: ((ان هذا الدين متين فأوغِلو فيه برفـق))[1] واتـه : بەڕاسـتی ئـەم ئاینە توندو قایمە، جابە شێوەی نەرم و نیانیـەوە بچنـە نێوی، هـەروەها لـە شوێنێکی تردا دەفەرمووێ : ((ان الرفق لايكون فى شيْ الا زانهُ, ولا يترع من شيْ إلاّ شـلنهُ))[2] واتـه : نـەرم و نیـانی و میهرەبانی لـە هـەر شتێك دا بێـت دەیڕازێنێتەوە، بـەڵام لـە هـەر شـێك نەهێشـتراو دامـاڵێندرا، ئـەوە ناشـیرینی دەكات.

بۆیە دەبینین پەیامی پیرۆزی ئیسلام بایـەخ زۆر بـەم خەسـڵەتە پەسـندە

---

١ -أخرجه أحمد ( ١٩٩/٣) عن أس.

٢. رواه مسلم (٢٥٩٤)٢١ – مسلم (٢٥٩٤).

دەدات، بە شێوەیەك نەك بە تەنها داوا لە مرۆڤێك دەكات كـە نـەرم و نیـان و میـهرەبان بێـت بەرامبـەر مرۆڤێكـی تـر، تەنانــەت بەرامبــەر گیانلەبــەرانیش فـەرمانی پێكـراوە!؟ بـۆ نموونــە دەڵێـت جارێكیــان عائیشــە-ی دایكــی بـڕواداران-خـوای لێ ڕازی بـێ- سـواری وشـترێك دەبێـت دیـارە هێـواش و لەسەرخۆ بووە لە ڕۆیشتن دا، بۆیە دایكی ئیماندارانیش تەنگـەتاوی دەكـات، پێغەمبەری بەسۆزیش ﷺ بەم كارەی ئەو ڕازی نابێ، دەفەرموێ : ((علیــك بالرفق)) واتە: لەگەڵیدا نەرم و نیان و هێواش و میهرەبان بە.[1]

بەڵێ فەقێی نەرم و نیان و بە سۆز :

پەیامە پڕ لە دادوەریەكەی خوای مەزن ، ئاوا داكۆكی لە مافەكانی مـرۆڤ تەنانەت گیانلەبەرانیش دەكات، هانی شوێن كـەوتوانی دەدات - بـە تایبـەت زاناو بانگبەرو پێشەواكانی - ئەوەندە بەسۆزو میهرەبان و سینگ فراوان بـن لەگـەڵ دەورو بـەریاندا، ئەگـەر تەنـها مێشـوولەیەك - بـەڵێ مێشـوولەیەك - كەوتە نێو ئاوێك، پێویستە فریـای بكـەوێ و دەست و پەنجـەت بخەیتـە نێـو ئاوەكە بۆ دوور خستنەوەی لە مەترسی و ڕزگار كردنی لە مەرگ.!!

### ٨- چاوپۆشی و لێبووردەیی :

ڕەوشت و خەسڵەتێكی تر، كە پێویستە - قوتابی زانستە شــەرعیەكان - بیكـات بـە سـیمای خـۆی بریتیـە لـە (چـاو پۆشـی و لێبووردەیـی) هەڵبەتــە لێبووردەیی (السماحة) بە درێژایی مێـژووی مرۆڤایـەتی بـە گشـتی و مێـژووی ئیسلامی بە تایبەتی ڕەوشتی بەرزی هەڵگرانی پەیامی خوا بووە و لە ژیـان و هەڵسوكەوتی ڕۆژانەیاندا بە زەقی بەرچاو دەكەوێ.

---

١ المصفى من صفاة الدعاة/ الكتاب الأول ص٤٩

ئازیزان :

بێگومان هەگبەی مێژوو، پڕاوپڕە لە ڕووداو وبەسەرهاتی هەمەچەشن و هەمەجۆر لەم بارەیەوە، لاپەڕە زێڕینەکانی پێ نەخشاندووەو ڕەنگینی کردووە، ئێمە لێرەوە تەنها نموونەیەك لەم بارەیەوە ئەخەینە ڕوو، کە لە یەکێك لە نەوەو بنەماڵە بەڕێزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی داوەو گێڕدراوەتەوە، کە ئەویش زاناو پێشەوا (علی کوڕی حوسەینی کوڕی علی کوڕی ئەبی تالیب)ە-خوا لە هەموویان ڕازی بێت - کە بە (زین العابدین ) ناوزەد کراوەو شۆرەتی دەرکردووە -

جارێکیان کەنیزە (جاریة)یەك بە مەسینە ئاو بەدەستی ئەو بەڕێزەدا دەکات بۆ دەست نوێژ گرتن، بەبێ دەستی کەنیزەکە مەسینەکەی لەدەستی دەکەوێتە خوارەوە ڕووی پێشەوای ناوبراو بریندار دەکات، ئەویش دیارە بە گلەییەکەوە سەرنجێکی دەکاو سەری بۆ لا هەڵدەبڕێ، کەنیزەکەش یەکسەر دەڵێ : خوای مەزن دەفەرمووێ : ﴿والکاظمین الغیظ﴾ واتە: ئەوانەی تووڕەیی خۆیان قووت دەدەنەوە و دان بە خۆیان دا دەگرن. پێشەوا (زین العابدین)یش دەڵێت: ئەوا رق و تووڕەیی خۆم قوت دایەوە، کەنیزەکە دەڵێت: ﴿ والعافین عن الناس ﴾ ئەوانەی چاوپۆشی لە خەڵکی دەکەن و لێیان دەبوورن، ئەویش دەفەرمووێ: خوا لێت ببورێ ئەوا منیش بووراوم، ئەو جارەیان کەنیزەکە دەڵێ: ﴿ والله یحب المحسنین ﴾ خوا چاکەکارانی خۆش دەوێن، ئەویش دەڵێ: دەبڕۆ لەڕێی خوا ئازاد بە، دەستبەجێ ئازادی دەکات! !

پێشەوا(شافیعی)ش لە شیعرێکیدا دەربارەی بێ دەنگ بوون لە بەرامبەر مرۆڤی نەفام و ئەدەب نزمدا فەرموویەتی:

یُخَاطِبُني الّسفیهُ بِکُلِّ قُبْحٍ    فَأکْرَهُ أنْ أکُونَ لَهُ مُجیبا

يَزيدُ سَفاهَةً فَأَزيدُ حِلمـــاً          كَعُودٍ زَادَهُ الإِحْراقُ طيبـــًا

واتە: بابای نەفام و فـام کـاڵ بـەو پـەڕی شـێوەی ناشـیرینی دەمدوێنـێ، بەڵام من حەز ناکەم و نامەوێ وەڵامی بدەمەوە، هەرچەند ئەو نەفامێتی زیاد بکات منیش لە بەرامبەریا هێمنی زیاد دەکەم بە شێوەی بخـوور کـەوا هـەتا بسوتێندرێ بۆنی خۆشی زیاتر دەبێ.

## ٩- زوو تووڕە نەبوون و بە حەوسەڵەیی:

خەسڵەتێکی تر لەو خەسڵەتە بەرزانەی، قوتابی زانسـتە شـەرعیەکان- پێوەی ناسراوە و دەناسرێ بریتی‌یە لە زوو تووڕە نەبوون و بـە حەوسـەڵەیی و هێمن و ئارام بوون لە حاڵەتی بینین و بەرچاو کەوتنی کارێك یا هەڵوێست و گوفتارێکی نائاسایی و ناشیاو ونابەجێ، چونکـە وەکـو خواناسـە رووناکبـیرو رۆشەنفکرە موسڵمانەکان گووتویانە: تووڕەیـی(الغضـب) رەشـەبایەکە چـرای عەقڵ دەکوژێنێتـەوە، هەڵبەتـە مرۆڤیـش بـە هـۆی عەقڵـەوە چاکـەو خراپـەو رەش و سپی و راست و چەوت لێك جیـا دەکاتـەوە، ئینجـا هـەر کـات مـرۆڤ ژێری-عقل-ی لە دەست داو دەسەڵات و حوکمی ژێری بەسـەرەوە نـەماو لـە ژێر کۆنترۆلی عەقڵەوە چوەدەر، بێگومان ئەو کات نەك هەر لە ریزی مرۆڤەوە دەشـۆرێت و نـامێنێت بـەڵکو دادەبـەزێ و نـزم دەبێتـەوە بـۆ ریـزی مـاڵات و گیانلەبەران. ! ؟بـۆ ئـەم مەبەستەش پێغەمبـەری چـاو سـاغی مرۆڤایـەتی ﷺ فەرموویەتی: ((ليس الشديد بالصرعة إنما الشديد الذي يملـــك نفســـه عنـــد الغضب))[1] واتە: بابای پاڵەوان ئەو کەسـە نی‌یـە، کـە زۆر خـەڵکی لـە زەوی بدات بەڵکو ئەو کەسەیە، کە لـە حاڵـەتی تووڕەیـی دا دان بـەخۆی دابگـرێ و بەسەرخۆیدا زاڵ دەبێت.

---

١ -متفق عليه : البخاري : ٦١١٤, مسلم : ٢٦٠٩

ئیمامی شافیعی –خوای لیّ رازی بیّت– لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ((مَنْ أسْتُغضبَ وَلَمْ يَغْضَبْ فَهوَ حِمارٌ، وَمَنْ اسْتُرضيَ وَلَم يَرْضى فَهوَ شَيْطان)) واتە: هەر کەسیّك توورە بکریّ و توورە نەبیّ ئەوە گویّ دریّژە، هەرکەس رازی بکریّ و عوزری بۆ بهیّنریّتەوە رازی نەبیّ ئەوە شەیتانە .

کەواتە بەپیّی ئەم فەرموودەیە موسلّمان پیّویستە توورەیی هەبیّ بەلاّم بۆ کات و شویّنی خۆی و لە چوارچیّوەی شەرع دەرنەچیّت .

## ١٠- بۆ ئیسلام بە پەرۆش و خەمخۆرو دلّسۆزبوون:

ئیسلام کە دواهەمین دیاری و پەیامی خوایە بۆ تیّکرای مرۆڤایەتی؛ هەموو فەردیّك لەم ئوممەتە لە ئاستیدا بەرپرسیارە، بەلاّم ئەوەی راستی بیّ قورسایی ئەم بەرپرسیاریەتە زیاتر دەکەویّتە ئەستۆی خوازیارانی زانست چ وەك زانا بیّ یان قوتابی و زیاتر روو لە وان دەکات، چونکە ئەم تویّژە هەم لای خواو هەمیش خەلّکی – تەنانەت خودی خۆشیان – بە چاوساغ و پیّشەواو رابەری ئەم پەیامە هەژمار دەکریّت و حسابی لەگەلّ دا دەکریّت .

جا مادام وابیّ پیّویستە قوتابی لەپالّ ئەهەمیەتدانی بەباری هۆشیاری زانستی بایەخیش بە باری پەرۆشی و بە مشووری و دلّسۆزی و بەرپرسیاریەتی لە ئاست ئەم پەیامەدا بدات، بۆ ئەم مەبەستەش سەرجەم هۆو وەسیلە و تواناکان بخاتە گەڕ لە هەمبەر خزمت کردنی دا.

(شیّخ عبدالقادر)ی گەیلانی –رەحمەتی خوای لیّ بیّت– لە چەند قسەیەکی دا دلّسووتان و پەرۆشی خۆی دەردەبڕیّ و دەفەرمویّ: ((دینُ محمد ﷺ تَتَواقعُ حِيطانُه وَيتَناثرُ أساسُه، هَلُمّوا يا أهلَ الارضِ نُشَيّد ماأنْهَدَمَ وَنَقيمُ ما وقعَ، هذا شيء مايتّم، ياشمسُ ويا قمرُ ويا نهارُ تعالَوا))[1] واتە:

---

١ –(الفتح الرباني)/ص ٦٤٨

ئایینی موحەممەدﷺ دیوارەکانی دەڕوخێن و بناغەکەی پەرش و بڵاو دەبێ، ئەی خەڵکی سەر زەوی وەرن ڕاکەن بانەوەی ڕوخاوەو ڕماوە چاکی بکەینەوە و ئەوەی کەوتووە ڕاستی بکەینەوە، ئەمەکارێکە تەنها بە ئێمە تەواو نابێ،ئەی خۆرو مانگ و ئەی ڕۆژگار ئێوەش وەرن!

شێخ ئەمجەد زهاویش – ڕەحمەتی خوای لێبێت – لە وتەیەکی بەنرخیدا لە بارەی دەعوە و بانگەوازو کاری ئیسلامیدا گوتویەتی: (( لَو أني كنت قاضياً وأتاني شاهدٌ، وُعَلِمْتُ أنهُ يَقْطَعُ اللَيلَ والنهارَ بالْعبادة وَلا يَعْمَلُ للإسلام أعدُّه فاسقا وَ أرُدُّ شهادَتَهُ ))[1] واتە: ئەگەر بێت و من قازی بم و شایەدێك بێتە لام بۆ شایەدی دان بشزانم بە شەو و ڕۆژ بە خواپەرستی بە سەر دەبات، بەڵام کار بۆ ئیسلام ناکات! ئەوە بە فاسقی دادەنێم و شایەدیەکەشی ڕەت دەکەمەوە!

### ١١- پابەند بوون بە کیتاب و سوننەتەوە:

ئەدەب و ڕەوشتێکی پەسند و بەرچاوی تری فێرخوازی ناوبراو بریتییە لە پێداگیری کردن و لانەدان و پابەند بوونی بە ( قورئان و سوننە)تەوە.

پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی: (( تركت فيكم أمرين لن تضلوا ماتمسكتم بهما، كتاب الله وسنة رسوله ))[2] واتە: دوو شتم لە نێو ئێوەدا بەجێ هێشتووە تا دەستیان پێوە بگرن گومڕاو سەرگەردان نابن، ئەویش کتابی خواو سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ .

ئەمەش هەندێ لە وتە و هەڵوێستی بەشێك لە زانایان لەم بارەیەوە:

١/ پێشەوا شافعی–ڕەحمەتی خوای لێ بێت– فەرموویەتی: ((كل مسألة

---

١ - لإمام أمجد بن محمد سعيد الزهاوي /ص٢١٩

٢ - صحيح، رواه الحاكم في( المستدرك)

تكلمت فيها بخلاف السنة، فأنا راجع عنها، في حياتي وبعد مماتي))[1]. واته: هەر بابەت و مەسەلەیەك بە پێچەوانەی سووننەتەوە قسەم لێ کردبێت و لێی دوابم من لێی پەشیمانم چ لە ژیان دابم چ دوای مردنم.

٢/ هەروەها (الربيع بن سليمان) گوتویەتی: شافیعی ڕۆژێك فەرموودەیەکی گێڕایەوە، پیاوێك پێی گوت: باوکی عەبدوڵلا تۆش بەمە بڕیار دەدەی؟ ئەویش لە وەڵام دا گوتی: ((متى ما رويت عن رسول الله ﷺ حديثا صحيحا، فلم آخذ به فأشهدكم أن عقلي قد ذهب )).[2]

٣- (عبدالله بن عمر)-خوای لێ ڕازی بێ - کە توندترین هاوەڵ (الصحابة) بووە لە هەمبەر دژایەتی وئینکاری کردنی بدعە وشوێن کەوتنی سوننەت: جارێك گوێی لە کابرایەك بوو پژمینی هات و گوتی (الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله)، ( ابن عمر ) پێی گوت: ما هكذا علمنا رسول الله - ﷺ - بل قال: (اذا عطس احدكم فليحمد الله) ولم يقل: ليصل على رسول الله.[3]

٤- هەروەها شێخ عبدالقادری گەیلانیش-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- قسەی بەهێز و گرینگی لەم بارەیەوە لێوە نەقل کراون بۆ وێنە: دەفەرموێ: ( كل حقيقة لا تشهد لها الشريعة فهي زندقة، طر إلى الحق عزوجل بجناحي الكتاب والسنة، أدخل عليه و يدك في يد الرسول ﷺ)[4] واتە: هەر حەقیقەتێك شەریعەت شایەدی بۆ نەدات ئەوە زەندەقە( بێ دینی)یە، بەرەو خوای شکۆمەند و زاڵ و پایە بەرز بە دووباڵی قورئان و سوننەت بفڕە، بڕۆ لای خواو، دەستت لە نێو دەستی پێغەمبەر ﷺ دابێت.

---

١ - أخرجه الخطيب في ( الفقيه والمتفقه ) له ( الوجيز في عقيدة السلف الصالح) ص/٢٠١ وەرگیراوە.

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣ - أخرجه الترمذي في (سننه) بسند حسن.

٤ -( الفتح الرباني) المجلس الرابع والأربعون.

## بەشی دووەم

# چەند ڕەوشت و خەسڵەتێکی پەیوەندیدار بە ژیانی زانستیی قوتابی - زانستە شەرعیەکان - دا .

### ١- هیممەت بەرزی:-

یەکێك لەو ڕەوشتانەی ئاینی ئیسلام داوا لە مرۆڤ بە گشتی و توێژی قوتابی بەتایبەت دەکات، کە خۆیان پێی برازێننەوەو ئارایشدەن، بریتیە لە -هیممەت بەرزی- ئەو هیممەت بەرزیەی، کە مەڵبەندی چاکی و خراپی و سەلبیات و ئیجابیاتی مرۆڤە، کە وەك سانسۆر و چاودێرێك وایە بەسەر ئەندامەکانیەوە و سەرفرازی و خێرو خۆشی‌یەکی نەبڕاوەش بە مرۆڤ ئەبەخشێ، هەروەها هۆکارێکی بەهێزیشە بۆ گەیشتن و بەرزبوونەوەی بە پلەکانی کامل بوون -درجات الکمال - دیسان بوێری و چاونەترس و جوامێری و خۆڕاگری و ماندوونەناسی لە گۆڕەپانی زانست، کردار ئەخاتە نێو دەمارەکانی و خوێن ئاسایانە هاموو شۆ دەکەن، وەك چۆن بێ جورئەتی و ڕوکاری و ڕیاکاری و بێ هەڵوێستی و ژێر دەستەیی ڕیشەکیش دەکات .

بێگومان بابای هیممەت بەرز هەردەم وورەبەرز و خۆڕاگرە، هەڵوێستەکان نایترسێنن! کەچی مرۆڤی بێ هیممەت تا بڵێی مرۆڤێکی ترسنۆك و ڕووخاوە، دەمیشی وەك چۆن بڵێی گاڵەدرا بێ ئاوایە، تەنانەت تاکە وتەیەکی ڕەواو بەجێ و لەجێی لێ نابیسترێ، چونکە خۆپەرست و خۆپەسەندە، بۆیە شێخ عبدالقادری گەیلانیش-ڕەحمەتی خوای لێ بێت- دەڵێ: ((کونوا مع الهمم العالیة)) واتە: لەگەڵ هیممەت بەرزانا بن، بەڵام فێرخوازی بەڕێز و وریا با بەهەڵەدا نەچی، هیممەت بەرزی-کبر الهمة - و لوت بەرزی-الکبر-ت لێ

تێکەڵ نەبێت، چونکە ئەم دوانە بەقەد ئاسمان و ڕێسمان لە یەکەوە دوورن، هیممەت بەرزی خەسڵەتی بەرزی میراتگرانی پێغەمبەرانە علیهم السلام- بەڵام خۆ بە گەورە گرتن و لوت بەرزی دەردی ئەمانەیە، بەدرێژایی مێژوو لەوەتەی ژیان لەسەر ئەم هەسارەیە بەرقرارە گیرۆدەی ڤایرۆسی زۆرداری و ستەم کاری و بەدڕەفتاری بوون[1]!؟

*کەوابێ فەقێی دڵسۆزو بە هیممەت:*

دەروونت لە سەر ئەم خەسڵەتە بەرز و بەفەڕە ڕا بهێنە، نەکەی پشگوێی بخەیت و بە هەندی هەڵنەگری..

ئینجا بۆ زیاتر زانیاری و چاکتر ناسینی ئەم خەسڵەتەش دەتوانیت سەرنجێکی سەرچاوە فیقهیەکان بدەین، بۆ ئەوەی لەم لایەنەشەوە گرینگی و بایەخی خەسڵەتی ناوبراومان بۆ ڕوون بێتەوە، کە لە چەندین شوێنەوە ئاماژەی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی پێ کراوە بە مەبەستی ڕاهێنان و پەروەردە کردنی خوێندکارانی - زانستە شەرعیەکان - لەسەری و بە واقیعی کردنی لە ژیاندا بۆ نموونە:

شەرع ڕێگە بە کەسێکی ئەرکبار(مکلف) دەدات، کە لەکاتی بەدەست نەکەوتنی ئاوی دەستنوێژ تەیەموم بکات. ناچار-مُلزَم-ی نەکردووە ئەگەر کەسێك پارەی ئاوی دەستنوێژی پێ ببەخشێ قبوڵی بکات و ڕەتی نەکاتەوە.. چونکە ئەمە منەتێکی تێدایەو لە هیممەت بەرزیش کەم دەکاتەوە، عەرەبیش گوتوویانە: ((منة الجبال أثقل من الجبال)) .

هەروەها پێشەوا شافیعی جوامێرو خاوەن عززەت و هیممەتیش فەرموویەتی: (( لو علمت شرب الماء البارد ينقص من مرؤتي لما شربته))

---

[1] حسه طالب العلم ص/٣٥

واتە: گەر بزانم خواردنەوەی ئاوی سارد لە پایە و کەسایەتیم کەم دەکاتەوە نایخۆمەوە.!

### ٢-ئەمانەتی زانستیی:

پێویستە لەسەر خوێندکاری – زانستە شەرعیەکان – بەو پەڕی توانا و لێبڕانیەوە خۆی لەسەر خەسڵەتی (ئەمانەتی زانستی ) ڕا بهێنێ لە سەرجەم ئەم بوارانەی خوارەوە ڕەنگ بداتەوە، وەکو زانستخوازی و بانگەواز و ڕاگەیاندن و کردار و گوفتار و جێ بەجێ کردن و...تاد .

چونکە بێگومان بەختەوەری و سەرفرازی گەل لە چاکبوونی کردەوەکانیەتی، چاکبوونی کردەوەکانیشی لە ساغ بوون و بێ خلّتەبوونی زانستەکەیەتی، هەڵبەت ساغبوون و ڕاست بوون و بێ خلّتە بوونی زانستیش لەوەدایە، کەوا هەڵگرانی پیاوانێکی ئەمین و دەست و دەم پاك بن لەوەی دەیگێڕنەوە، یاخود باسی لێوە دەکەن، چونکە هەر کەسێك دەربارەی زانست–العلم– بەبێ ڕەچاوکردنی مەرجی –ئەمانەتی زانستی– بدوێ، لە ڕاستیدا زانستەکەی گیرۆدەی حاڵەتێکی نالەبار کردووە، چونکە ئەم جۆرە کارە نەك تەنها خزمەت بە بواری زانست و زانستخوازیەوە ناکات تەنانەت سەرچاوەکەشی لێڵ کردووەو کۆسپ و تەگەرەیەکیشی خستۆتە بەردەم بەختەوەری و سەرفرازی و ڕاستەڕێ بوونی نەتەوەی ئیسلام.[1]

هەڵبەتە هیچێك لەو کۆڕو کۆمەڵانەی، کە لە زانستێك لە زانستەکان دەناسرێن خاڵی و بەدەر نین لە کەسانێکی وا، کە ڕێگای زانست و گەڕان بەدوای زانیاری، یان بە ئامانجێکی پاك و دڵسۆزیەکی خاوێن وەك ڕەزامەندی خوا و خزمەت بە گەل و ڕەوشت و ئاکار بەرزی و هتد.وە نەگرتووە،

---

١ - حلية طالب العلم/ص- ٤٢

بەڵكو بازرگانی پێوە دەكەن و بە وەسیلەی ژیانیانی دەزانن، ئینجا نموونەی ئەوانە هەرگیز ئەمانەتی زانستی‌یان لە دەرووندا بەرقەرار نابێ و جێی خۆی ناگرێ، بۆیە دەبینیین گوێ بەمە نادەن شتێك بگێڕنەوە، كە نەیان بیستوە، یان باس لە بابەت و مەسەلەیەكەوە بكەن، كە نەیانزانیوەو فێری نەبوونە، یاخود وەڵامی پرسیارێك بدەنەوە، كە نایزانن و شارەزاییان دەربارەی نیە ! ؟

خوێنەری بەڕێز:

دەردی لە هەموان گرانتر ئەو دیاردە كوشندەو زیانبەخشەیە، كە ئیمڕۆ زۆرێك لە قوتابی فەقێ– و مامۆستایانی ئایینی دووچاری بوون كەبریتی‌یە لە:

جۆرە كتێب و پەڕتووكی وا دەكەن بە سەرچاوەی وەرگرتن(مصدر التلقي) یان بۆ وتاردان و موحازەرە و كۆڕ و مەجلیس پێ گەرم كردن، بە بێ ئەوەی رەچاوی ئەمە بكەن، كە ئایا ئەم كتێب و پەڕتووكانە ئامازەیان بە پلەی راستیەتی(درجة الصحة)ی فەرموودە و راوی و سەرچاوە متمانە پێكراوەكان(المصادر الموثوقة) كردووە یاخود نا ! ؟

بۆیە زانا پێشووەكان شارەزاییەكی چاكیان هەبووە دەربارەی زانستی– رەخنەگرتن لەپیاوان (نقد الرجال) كە مەبەست پیاوانی راوی یە، هەروەها جیاكردنەوەی كەسێك كەوا لە گێڕانەوەدا موبالەغە و زێدەڕۆیی هەبێت لەگەڵ كەسێكی تر كە بەم شێوەیە نەبێت، تا ئەو ئاستەی وەكو زانستێكی سەربەخۆیان تەماشا كردووە، تاكو قوتابی زانستە شەرعیەكان لە سەر بەرچاو روونی(البصیرة) بن و بڕۆن، بەشێوەیەك بەها و قیمەتی ئەوەی دەیخوێننەوە بزانن، راست و ناراست و بەهێزو بێهێزیان لێ تێكەڵ نەبێت.

### ٣-راستگۆیی (الصدق):

راستگۆیی ئەم خەسڵەتە بەرزو پەسندەیە هێمایەکە بۆ ژیری و ویقار و بەڕێزی و دەروونپاکی خودی تاك (فرد)ی راستگۆ، هەروەها هەڵگری خۆشەویستی و تەبایی نێوان خەڵکەو بەختەوەری کۆمەڵ و پارێزەری ئایینە!

بۆیە پابەند بوون بەم خەسڵەتە بەپێی دەقە شەرعیەکان، بە (فرض العین) لەقەڵەم ئەدرێ، جا پێویستە یەکە یەکەی ئەندامانی کۆمەڵگای ئیسلامی پێیەوە پابەند بن، چونکە خەسڵەتێکە خێری دونیاو دوارۆژی پێوەیەو پێچەوانەکەشی دوارۆژیکی رەش بۆ مرۆڤ ئەخوڵقێنێ

پێشەوا ئەوزاعیش رەحمەتی خوای لێ بێت لەم بارەیەوە دەفەرمووێت: (( تعلم الصدق قبل أن تتعلم العلم)) واتە: بەر لەوەی فێری زانیاری بیت، فێری راستگۆیی بە.

هەروەك پێشەوا وەکیعیش دەفەرمووێ: ((هذه الصنعة لايرتفع فيها إلا الصادق))[1] واتە: ئەم پیشەیە هیچ کەس تیایدا بەرز نابێتەوە، مەگەر بابای راستگۆ نەبێ!.

خوێندکاری سەنگین: هەوڵدە پێش ئەوەی خۆت لەقەرەی کاروانی زانست خوازان و کۆکردنەوەی زانیاری بدەی فێری راستگۆیی ببیت و سیمایەکی زەق و بەرچاو بیت لە پێکهاتەی کەسایەتی خۆت لە سەرجەم هەڵس و کەوتەکانت رەنگ بداتەوە، تاکو لە تێکڕای قۆناغەکانی فێرخوازیتا سەرفرازانە هەنگاو بنێیت و بگەیت بە دوا مەنزڵ و نەگلێیت.

---

١ - ئەم دوو وتەیە حەتیبی بەغدادی لە پەرتووکی ( الجامع ) دا هێناویەتی

هەڵبەتە راستگۆیش کە بریتی‌یە لە : دەربڕینی وتەو گوفتار بەشێوەیەك کەوا لە گەڵ بیرو باوەڕ و واقیعدا یەك بگرێتەوە و ناکۆکی و دژایەتی نەبێت، تەنها یەك جۆری هەیە، بەڵام پێچەوانەکەی واتە درۆکاری(الکذب) چەندەها شێوە و جۆر و مەسەلەکی جۆراوجۆر و هەمەچەشنی هەن وەکو :

١- (کذب المتملق) کە بریتی یە لە گوفتاری پێچەوانەو دژ لە گەڵ واقیع و بیرو باوەڕدا، وەك کەسێکی دەروون نزم و دونیا ویست وەسفی کەسێکی دوور لە ئایین و خراپەکار، یا نەفام و بیدعەکار کەخودی خۆشی چاك چاك دەیناسێ بکات بە مرۆڤێکی ئایین پەروەر و چاکە کارو زانا و راست و ساغ و تەواو بۆ مەرام و مەبەستێکی تایبەت بە خۆی کەلەم سەردەمەی ئێستادا ئەم جۆرە کەسە بە بابای ماستاوچی ناوزەد دەکرێ.

٢- (کذب المنافق): ئەوەشیان بریتی‌یە لە گوفتارێکی وا کە تەواو لەگەڵ بیرو باوەڕدا پێچەوانەو دژ بێت، بەڵام لەگەڵ واقیعدا ناکۆك نی‌یەو یەك دەگرێتەوە، وەك ئەو جۆرە کەسە دوو ڕوو (المنافق)ەی لە ژێر ناو و شۆرەتی جۆر بە جۆر خۆی حەشار دەدات وەکو ئەهلی سوننەو جەماعەو تەزکییەو تەسەوف و پەروەردەو بانگەواز و هتد.. بۆ خۆ مەڵاسدان و نەناسرانی شێوەی دوان و هەڵس و کەوتیان نیشان دەدات و دەمامکی ساختەکاری ناوەتە سەر ڕووی نەگریسی بەمەبەستێك کورد گوتەنی (گورگە بەڵام خۆی لە پێستی مەڕ نیشان دەدات!؟)

٣- (کذب الغبی): ئەمەیان وتەو گوفتارێکە لەگەڵ واقیعدا تێك ناکاتەوەو پێکڕا هەڵناکەن، بەڵام لەگەڵ بیرو باوەڕدا هیچ جۆرە دژایەتی و ناکۆکی‌یەکیان نی‌یە و یەك دەگرنەوە، وەك ئەو موسڵمانە ساویلکەو ناحاڵی‌یەی، کە ئەگەر کەسێکی وای کەوتە بەر چاو کەوا کەمێك بە عەقڵی‌یەوە بنووسێت -لە بوارێك لە بوارەکانەوە- دەست بەجێ شایەتی:

(وەلێیتی و زانایەتی و لێهاتوویی و ...هتد)ی بۆ دەدات ئەگەر چی لە واقعیشدا، واقیع راستی‌یەتی ئەم شایەتی‌یەی بۆ ناسەلمێنی و مرۆڤێکی شایستە بەم پلەو پایەو مەقامەیش نیە ! !.

ئینجا خوێنەر و فەقێی راستی ویست:

پەیوەسست بە بەڕاستە شەقامی راستگۆیی و دەمت مەجوولێنەو مەیکەرەوە بۆ دەربڕینی هیچ قسەیەك، مەگەر لە سەرچاوەیەکی بێگەرد و هەست و نەستێکی خاوێن و راستگۆیانەوە نەبێت..

واتە: دەم و دەروونت و گوفتار و هەستت یەکسان بێت لە ئان و ساتی دەربڕینی هەر وتەو گوفتارێکدا، وەکو خۆشەویستی و دۆستایەتی و رق لێبوونەوەو دژایەتی و..هتد، چونکە بێگومان مرۆڤی راستگۆ بە کەسێك نالێت من تۆم خۆش دەوێت کەچی واقیعی حاڵیش شایەتی بۆ نەدات و تاکە نیشانەیەکی خۆشەویستیشی لێ بەدی نەکرێت، هەروەها دەربارەی شتێك یان مەسەلەیەك، کە نەیبیستووەو زانیاری دەربارەی نیە، نالێت بیستوومە یانە... هتد.

پێشەوا شافیعی خوا لێی رازی بێت فەرموویەتی: ((ماکذبت قطّ، ولا حلفت بالله لا صادقاً ولا کاذباً)) واتە: هەرگیز درۆم نەکردووە، نەبەڕاست و نە بە درۆش سوێندم بە خوا نەخواردووە !.

کەواتە دەبێ زۆر وریا بیت، نەبادا ناوت بخرێتە فۆڕم و لیستی درۆزنان، ئەگەر دەروونی سەرکەشیش وازی نەهێناو هانی دەدای بۆ گوفتارێکی نادروست و درۆ، دەتوانیت بەم هۆیانەی خوارەوە خۆت قورتار بکەیت و بەسەریا زاڵ بیت:-

أ- بیرکردنەوەو سەرنج دان لە ریز و پایەی خەسڵەتی راستگۆیی و راستی پەروەران.

ب- بیرکردنەوەو تێفکرین لە سووکی و بێ نرخی درۆکـردن و شـەرمەزاری و ریسوایی درۆزنان.

ج- هەروەها تێفکرین و دەرککردنی ئەم حەقیقەت و راستی‌یە، کـە پـەتی درۆ کورتە و بـەزوویی دەمـامکی سـەر رووی نەگریسـی والا دەبێـت[1]. کـورد گۆتەنی (مەیدانی درۆیێ کورتە !).

د- داواکردنـی کۆمـەك و هاوکاری لـە خـوای بـە بـەزەیی و میـهرەبان و دەستەو سان نەنواندن.

**تێبینی‌یەك:**

هەڵبەتە هەر قوتابی فەقێ یەك راستە شەقامی راستگۆیی بەجێهێشت و خۆی دووچاری کەند و کۆسپ و تەگەرەکانی رێچکەی درۆو درۆکـاری کـرد، بە هـۆی دەردی کێبـەرکێ (منافسـة)ی هـاوەڵ و هاوکارانی بــە مەبەسـتی دەستەبەرکردنی ناو و شۆرەت و نازناوی زیرەکی زانایـەتی و لێـهاتوویی و تاد، پێویستە ئەم راستی‌یەش بزانێ و چاك دەرکی بکات، کەوا هـەر کەسێك خۆی بگەیێنێ و بگات بە هەر جۆرە پلەو پایەیەك لەسەرووی ئاست و توانای خۆیەوە، دەبێ بزانێ کەوا کەسانێك هەن لە بۆسەو کەمیندان بـۆی، خـاوەنی زانسـت و زانیاریـەکی بـێ وێنـەو قەڵـەم و پێنووسـێکی بـە برشـت و ویــژدان پـەروەرو رەخنـەگرن، ئـەم پلـەو پایـەو نـاو و شـۆرەتەی بـە پـێی پــەرێز و شوێنەوار هەڵدەسەنگێنن و وەزن دەکەن، ئیتر دوایی حەتمەن گیرۆدەی ئـەم سێ سەرگەردانیە دەبێت:

١- لەدەست دانی متمانە (الثقة) و بـاوەرپێکراوی لـە نێـو دڵ و دەروونـی خەڵکی و کۆمەڵ.

---

[1] حليه طالب العلم ص/٤٤

٢- له دهست چوون و به فیرۆدانی زانستهكهت و باوهڕ پێ نهكردن و وهرنهگرتنی له لایهن دهورووبهرهوه.

٣- سهرهنجام خهڵكی باوهڕت پێ ناكهن ئهگهر چی راستگۆ بیت و راستیش بڵێی.

به كورتی ههر كهسێك درۆكاری و جوانكاری له گوفتار بكات به پیشهی رۆژانهی ئهو كهسه هاوكارو برای جادووگهر(الساحر)ه بێگومانیشین كهوا ﴿ولا يفلح الساحر حيث أتى﴾.[1]

## ٤- پهنا بردن بۆ لای خوا لهزانست خوازیدا:

برای فێرخواز: بێگومان مرۆڤهكان ههموویان یهكسان نین له ئاست و توانای وهرگرتن و تێگهیشتن و فێربوونی زانستهكان، بهڵكو ئاستی جیاوازو خواست و ئارهزووی جیاجیایان ههیه، بۆیه ههر كاتێك زانستێك له زانستهكانت به لاوه بوو فێربوون و وهرگرتنی ئهستهم و زهحمهت بوو دڵ تهنگ و ناڕهحهت مهبه و دهستهوسانی و بێ توانایی مهنوێنهو سارد نهبیتهوه، چونكه ئهمه شتێكی سروشتییه و به تهنها له تۆوه رووی نهداوه، بهڵكو چهندین زانای بهناوبانگ دووچاری ئهم حاڵهته هاتوون، تهنانهت هی وایان ههیه زۆر به راشكاوییهوه ئامـاژهی بهم حاڵهته كردووه، ههر وهك چۆن له ژیاننامهكهیاندا بهرچاو دهكهوێ لهوانه:

١- (الأصمعي) له زانستی (العروض) دا.

٢-(السيوطي) له بیركاری (رياضيات)دا.

٣-(الزهاوي) زانای فهرموودهناس له (خط)دا.

٤- (ابن الصلاح) له (منطق)دا.

---

[1] - حلية طالب العلم/ص- ٤٥

٥- (أبو مسلمي النحوي) له (صرف)دا.

٦- هەروەها ( أبـو عبيـدة، محمـد بـن عبدالبـاقي الأنصـاري، أبـو الحسـن القطيعـي، أبوزكريـا يحيـى بـن زيـاد الفـداء ، أبـو حـامد الغـزالي ) ئـەم پێنـــج زانایانەش لە زانستی نەحودا.[1]

کەواتە خوێنکاری دڵسۆز:

تۆش ویســت و ئـارەزووت دەربـارەی خوێنـدن و زانسـت خوازی‌یەکەتـەوە بەهێز بکە و زیاترو زیاتر بایەخی پێ بدە، هـەنگاو بنـێ بۆ بـەرەو پێشـەوەو بڕینی قۆناغەکانی خوێندنت بە پشـتیوانی خـوای میـهرەبان، ئەگـەر لـە هـەر ئاست و قۆناغێکیشدا زەحمەتی و تەگەرەیەکت هاتە بـەردەم دەست بـەجێ پەنا بۆلای خوابەو لێی بپاڕێوەو داوای کۆمەکی لێ بکە و دەسـتی پاڕانـەوەو سکالآت بەرز بکەرەوە بۆلای و لەبەر دەمیا بکرووزێوە، تاکو بەفریاتەوە بێت و سەرکەوتوو بیت، وەکو زانـای پایەبـەرز (إبـن تيميـة)-رەحمـەتی خـوای لێ بێت زۆرجـار ئەگـەر راڤـەو لێکدانـەوەی ئایـــەتێکی قورئــانی پـیرۆزی بــۆ نەدەهات و لێی دەوەستا، لەخوا دەپاڕایـەوە لـە پاڕانەوەکـەیدا دەیفـەرموو: ((اللهم يامعلم آدم وابراهيم علّمـني، ويـا مفـهم سـليمان فـهّمني))، دەگێڕنـەوە دەڵێن پاش ئەم دوعایە دەست بەجێ ماناکەی بۆ دەهات و راڤەی ئایەتەکەی دەکرد.[2]

## ٥-گەشتی زانستیی:

گەشت و گەڕان بەدوای زانست و زانیـاری سـیمایەکی زەقـی خوێندکـارانی زانسـتە شـەرعیەکان بـووە بـە درێژایـی مێــژوو، بێگومــان دەتوانـین بڵێــین

---

١ -حلية طالب العلم/ص- ٤٢

٢ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، وە (فتاوى ابن تيمية) ٣٨/٤

گەشتەکەش سنووردارو بەر تەسك نەبووە، بەڵکو بـەرفراوان بـووە و زۆربـەی شـارو دێهاتــەکانی گرتۆتــەوە، تەنانــەت جـاری واش هـــەبووە ســـنووری وڵاتەکەشیان بڕیوە، بۆ خوێندن و فەقێیاتی چوونەتە وڵاتە دراوسێکانیان..

هەڵبەتـە ئەمـــەش بـەکارێکی گرینـگ و بایـەخدار لـە ژیـان و مێـژووی خوێندکـارانی زانسـتیـیە شـەرعیەکان دەژمـێردرێ و بـە خـاڵێکی ئیجـابی و بەرهەمداریش لە قەڵەم ئەدرێ، چونکە گوتراوە: ( من لم یکن رُحلة لـن یکـون رِحلة ) ..

بەڵێ بێگومـان کەسێك گـەر بـەدوای زانیـاری نەگـەڕێ و گەشـت نـەکات و نەچێتە خزمەت مامۆستایانی پسپۆڕو بەهرەدار تاکو زانستیان لێوە فێر بـێ، دوورە ببێ بە کەسێکی شـیاو تـاکو خـەڵکی هاموشۆی بکـەن و بێنـە لای و زانسـت و زانیـاری لێـیـەوە فـێربن، چونکـە ئـەم زانـا بەڕێزانـە بەشـێکی زۆری تەمـەنیان لــە خوێنــدن و دەرس وتنــەوە ســەرف کــردووەو شـــەونخونیو تەجاروبی زۆریان بینیوە و نوکتە و بەهرەی زانستی و ڕاو سەرنجی ناوازەیان لا دەست دەکەوێ .

ئیمامی شافیعیش خوالێ ی ڕازیبێ دەربارەی گەڕانی بـەدوای زانیـاریدا لە شیعرێکیدا ئاوا دەفەرموێت:

سأضْرِبُ في طول البلادِ وعُرضها · أنــالُ مُرادي أو أموتُ غَريبــا
فإن تَلِفَتْ نَفســي فَللّـهِ دُرّهـــا وإنْ سَلـمت كانَ الرجوعُ قَريبا

واتە: بەدرێژی وپانایی وڵاتاندا دەڕۆم و دەگەڕێم، یان بە ئاوات و ئامـانجم دەگەم یاخود لە غەریبیدا سـەر دەنێمـەوەو دەمـرم، ئینجا ئەگـەر فـەوتام و مەرگ میوانم بـوو ئـەوە کـارێکی پەسـندم ئـەنجام داوە، ئەگـەر سـەلامەتیش دەرچووم گەڕانەوە نزیکە .

**تێبینییەکی گرینگ:**

هەڵبەتە گەشت و گەڕان بە مەبەستی پەیداکردنی عیلم و زانست کارێکی تابڵێی پیرۆزو پێویست و لەبارە، بەڵام بۆ فێرخواز و فەقێی وریا ئاگاداربە بێگومان ئەم گەشت و گەڕانە ئەگەر لە حاڵەتی ئاسایی خۆیدا دەرچوو کاریگەریەکی خراپی ئەبێ و ئاکامێکی سەلبی لێ ئەکەوێتەوە، وەك ئەوەی لەهیچ شوێنان مەدار نەکەی و قەرار نەگری، لە وەرزێکدا یەك دوو شوێنان بگۆڕی و بگەڕێی بەبێ بیانو و هەدەف و ئامانجێکی بەرهەمدار و بەجێ، چونکە ئەم کارە نەك خزمەت بە پرۆسەی خوێندن ناکات، بەڵکو لە زیان بەم لاوە کەڵکی تری لێ چاوەڕوان ناکرێ.

**٦- پاراستن و پارێزگاری کردنی زانیاری:**

ئەمەشیان بە سەرف کردنی ئەو پەڕی جوهد و تێکۆشان و هەوڵ و تەقەلا بە مەبەستی پاراستن و چاودێری و پارێزکردنی زانیاری بە شوێن کەوتن و کارپێکردنی دەستەبەر ئەبێ.

خەتیبی بەغدادیش رەحمەتی خوای لێبێت دەفەرمووێ: ((يجب على طالب الحديث آن يخلص نيته في طلبه، ويكون قصده وجه الله سبحانه))[1]

واتە: پێویستە لەسەر قوتابی فەرموودە (الحديث) نیەتی خۆی یەکلا بکاتەوە لە داواکردنیدا، مەبەست و نیازی تەنها خوای بەرز بێت ﷻ.

کەواتە نابێ و ناگونجێ خوێندکاری - زانستە شەرعیەکان گۆڕەپانی زانست خوازیەکەی بکات بە بازاڕێکی بازرگانی وەك وەسیلەو ئامرازی گەیشتن بە خۆزگە و ئاواتەکانی دونیایی و ڕێگایەك بۆ بەدەست هێنانی

---

١ - حلية طالب العلم/ص- ٣٨

پارووی چەورو سامان و دەست خۆشانەو ئافەرینی زۆردارو دونیاپەرستانە بەکاری بهێنێ، چونکە چەندین دەقی شەرعی لە قورئان سوننەت دا هەڕەشەی جۆراوجۆر لەم جۆرە دونیا پەرست و دونیا ویستانە دەکەن و دوارۆژێکی ڕەش و پڕ لە داماوی و سزاو ئازار و ئەشکەنجە و مەینەتیان بۆ وەسف دەکەن .

بۆیە پێویستە قوتابی زانستە شەرعیەکان خۆی دوور بگرێ لە کەشخەلێدان و فیز و خۆ بە گەورەگرتن بەسەر خەڵکی و تێکۆشان بۆ پلەو پایەی دونیایی و کەسب کردن و ڕاکێشانی جەماوەر گردکردنەوە لە دەوری خۆی لە بری بانگ کردن و گردکردنەوەی لە دەوری پەیامی ئیسلام و خزمەت بە ئیسلام چونکە زۆربەی ئەو دەرد و بەلا و مەینەتیانەی گیرۆدەی زانایان بوون لەم لایەنانەی سەرەوە سەریان هەڵداوەو سەرچاوەیان گرتووە!

ئینجا فێرخوازی ئازیز و هیوای دوارۆژی گەلی ئیسلام:

قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵماڵە و بە شێوەیەکی جیددی و دڵسۆزانە تێ بکۆشە و ڕەنج بدە بۆ پاراستن و پارێزگاریکردن لە – زانستە شەرعیەکان مشوور لە پرۆسەکە بخۆ و پەرەی پێ بدە و خزمەتی بکە، بە تێگەیشتن ولێ حاڵی بوون و لەخۆدا کردن بە حاڵ و ڕەنگدانەوەی لە ژیانی ڕۆژانەتدا، نەک بەتەنها بەدەرخ و ئەزبەرکردن و گوتنەوە وازبێنی و واش بزانی بەوەندە ئەرکی سەر شانت ئەنجام داوە و ئیتر پاڵی لێ بدەیتەوە. هەڵبەتە ئەوانەی بانگێشەی زانینی زانستە شەرعیەکان دەکەن و باسی جیاجیا دەربارەیان تەرح دەکەن کەسانێکی زۆرن و لە ژمار نایەن،بەڵام پارێزەری ڕاستەقینە و مشوور خۆری دڵسۆز یان کەمە، چونکە با دەیەهاو سەدەها زانای شەرع زان و هەڵکەوتوو و بلیمەت هەبن،کەڵکی چی هەیە ئەگەر ئەم زانیاریيەیان

بەکاریان نەهێناو لەخۆیاندا ڕەنگ نەداتەوەو نەیان کرد بە واقعی کۆمەڵگایان لەڕاستی دا حسابی نەبوونیان بۆ دەکرێ ئەگەرچی لە ژیانیش دابن چونکە بە شێوەیەکی کردەیی بوونی خۆیان نەسەلماندووە!

وەك پێشینان دەڵێن: (رب حاضر کالغائب) یاخود (رب عالم کالجاهل)[1].

کەواتە خوێنەری بەڕێز:

فێرخواز فەقێ ی ڕەسەن ئەو فێرخوازەیە کەوا تابڵێی پابەند بوونی بە سوننەت و ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەری پێشەوای ﷺ پێوە دیار بێت لە سەرجەم بوارەکانی ژیاندا، هەروەها تاکە مامۆستاو پێشەنگ و رابەری بۆ هەڵس و کەوت و جمو جۆڵ و چالاکیەکانی ژیانی تەنها و بە تەنیا پێغەمبەری رابەری مرۆڤایەتی ﷺ و شوێنکەوتووە بلیمەت و هەڵکەوتووەکانی خەت و ڕێبازی ئەون، وەك خوای زانا و کاربەجێ لەم بوارەیەوە دەفەرمووێ ﴿لقد کان لکم في رسول الله أسوة حسنة...﴾[2] زانای پایە بەرز (عبدالرحمن السعدي) لە تەفسیر و راڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەفەرمووێ: ((الأسوة نوعان: اسوة حسنة، اسوة سیئة، فاسوة حسنة في الرسول ﷺ وأما الأسوة لغیره إذا خالفه فهو الأسوة السیئة، کقول المشرکین حین دعتهم الرسل للتأسي بهم: ﴿إنا وجدنا آباءنا على امة وإنا على آثارهم مهتدون.﴾))[3] واتە: سەرمەشقی (الأسوة) دوو جۆری هەیە کە بریتین لە أ- سەرمەشقی چاك. ب- سەرمەشقی خراپ. ئینجا بێگومان سەرمەشقی و پێشەنگی چاك و ڕەوا لە پێغەمبەری خودا ﷺ هەیە، بەڵام سەرمەشقی بە پێشەنگ گرتنی غەیری

---

١ -حلیة طالب العلم،ص- ٣٨

٢ - الأحزاب/ ٢١

٣ - المصفی من صفات الدعاة، الکتاب الأول/ ١٨

پێغەمبەر ﷺ لە کاتێك دا پێچەوانەی ئەو بێ، ئەم جۆرەیان سەرمەشقی خراپ و ناڕەوایە، وەکو گوتەی هاوبەش بڕیاردەر(مشرك)ەکان کاتێك پێغەمبەران –علیهم الصلاة والسلام– بانگەوازیان دەکردن، تاکو شوێنیان بکەون و دەسبەرداری ڕێبازی نەفامی بۆماوەیان بن، دەیان گوت : باب و باپیرانمان بەم شێوە گوزەراندویانەو ئێمەش بەهەمان شێوەو بە هەمان ڕێگە دەگوزەرێنین.

برای فێرخواز و خوێنەری بەڕێز:

ئەوەی پێناسمان کرد خوێندکاری ڕەسەن و دڵسۆزە، نەك ئەم جۆرە خوێندکارەی، کە لە ئێستاوە خەریکە لەسەر حیسابی ئایینەکەی لە هەوڵی خۆگونجاندایە لە گەڵ واقیع.

کورد گوتەنی: ((لە گەڵ عامێ دەچیتە شامێ! ؟)) .

## ٧-زانیاری پاراستن بە نووسینەوە:

لە ڕاستیدا نووسینەوەو پەیوەست بوون بە سیستەمی نووسینەوەی دەرس و وانە زانستیەکان و دەرهێنان و نەقڵکردنی هەندێ بابەت و مەسائیلی دەگمەن و پێویست، کارێکی ئێجگار گرینگ و بەرهەمدارە، چونکە زانیاریەکان لە فەوتان و بە زایە چوون ڕزگار دەکات و ئاسانکاریەکی چاکیشە بۆ کاتی پێویست، شەکەتی و بە دوا گەڕان کەم دەکاتەوە، بەتایبەت بۆ کاتی بە ساڵاچوون و بێ هێزی و پڕکاری کەرەستە (مادة) ەیەکی تابڵێی بە کەڵك و ماندوو بوون و پێوە خەریك بوون و سەرقاڵبوونی زۆری گەرەك نیە..

بۆیە تۆش فەقێی بەڕێز:

کۆنووسێکی تایبەت و گونجاو دەست نیشان بکە بۆ تیا نووسینەوەو تۆمارکردنی سەرجەم ئەو بابەت و مەسەلە وردو بە کەڵك و زەروورانەی، کە لە ئەنجامی خوێندن و موتاڵا کردن و گوێ بیست بوون و . هتد دەوە بەدەستیان دێنی، هاوکات لە گەڵ ڕەچاو کردنی ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە:

١- نووسینی سەرەباسەکە.

٢- ناوی ئەو پەڕتووك و سەرچاوانەی کە لێتەوە وەرگرتووە.

٣- نووسینی ژمارەی لاپەڕەی سەرچاوەکە.

٤- ژمارەی بەرگ ( المجلد)ەکەی- ئەگەر لەبەرگێك زیاتر بێت.

٥- ئەگەر نەقڵکردنی تێدابێت ئاماژەی بۆ بکە، نەبادا لە گەڵ نەقڵ نەکراو تێکەڵ بێت.

٦- هەر وەك چۆن ئەگەر پەرتووکێك موتاڵا بکەیت و بیخوێنیتەوە پێویستە ژمارەی ئەو لاپەڕەیە بنووسیت کە ڕۆژانە لە سەری دەوەستی تاکو بازدانی تێنەکەوێ[1].

چونکە بێگومان مرۆڤ سروشتی وایە دووچاری بێهێزی زاکیرەو لە بیرچوون دێت، بۆیە (شعبی) دەفەرموێت: ((اذا سمعت شيئاً فاكتبه ولو في الحائط)) واتە: ئەگەر گوێ بیستی شتێك بوویت بینووسەوە، ئەگەر چی لەسەر دیواریش بێت.

بەڵێ بەڕاستی ئەم کۆنووسە لە تەنگانەترین و ناخۆشترین کاتەکان بە هاناتەوە دێت، دەگات بە فریات لەم ئان و ساتانەی تاکی خۆڕاگر و بە توانا دەستەوسان دەمینێت چ جای مرۆڤی بیرکۆڵ و بێ هێز.

---

١ - حلية طالب العلم. ص/٣٧

## ٨- پێداچوونەوەو بەسەرکردنەوەی دەرخکراو ( المحفوظات ) ەکان:

خەسڵەتێکی تری – قوتابی زانستە شەرعیەکان– بریتی‌یە لــە گرینگـی و ئەهمیەت دان بە دەرخکردن و ئەزبەرکردن، بەڵام گرینگـتر ئەوەیـە، کـە ئـەو مـەتن و بابـەت و باسـە گرینگانـەی دەرخ و ئەزبـەری کـردوون، پشــتگوێیان نەخات ماوە ماوە پێیان دابچێتەوەو بەسەریان کاتەوە، بەگوتنەوەو دووبـارە سەرنجدانەوەیان، تاوەکو لە هزرو بیریا ببن بە مەلەکەیـەك هـەرگیز لـە یـادی نەچنـەوە. چونکـە ئاگـادار نـەبوونیان و نەپاراستنیان بــە بەســەرکردنەوەو دووبارە گوتنەوە، هێمـای لـەبیرچوون و لـە دەسـت دان و بەزایەدانیانـە، جـا مرۆڤ لە هەر ئاستێك بێت.

ئیبن و عومەریش  خوای لێ رازی بێت– دەگێڕێتەوە لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: ((انما مثل صاحب القرآن كمثل الإبل المعلقة, ان عاهد عليــها أمسكها وإن أطلقها ذهبت)).[1]

(الحافظ ابن عبدالبر)–رەحمەتی خوای لێ بێت– دەڵـێ: ئـەم فەرموودەیـە بەڵگەیە لەسەر ئەو جۆرە کەسەی، کە زانستەکەی  بەسـەر نەکاتـەوەو پشـت گوێی بخات، تا لەدەستی دەچێت و زەرەرمەند دەبێت..

چونکە بێگومان زانستی هاوەڵە بەرێزەکانی پێغەمبەر ﷺ لەو سـەردەمەدا تەنها بریتی‌بوو لە قورئان وبەس، ئینجا ئەگـەر قورئـانێك کـەوا خوێندنـەوە و ئەزبەرکردنی لەوپەڕی ئاسانی دابێت، بەبەسەر نەکردنـەوە وریـا نـەبوونی لـە کیــس بچێــت، ئــەدی چ دەڵــێی دەربــارەی ئــەو زانســتە جــۆراو جــۆرو ئەستەمانەی ئێستا کە لـەئارادان کـە بێگومـان وەکـو قورئـانیش نـین لـە سانایی‌دا..

---

١ - رواه الشيخان ومالك في الموطأ. البخاري: ٥٠٣١، مسلم: ٧٨٩

ئایەتی: ﴿ ولقد یسرنا القرآن للذکر فـهل... ﴾[1] ئامـاژە بـەم راسـتی‌یە دەکات، هەڵبەتە باشترین و بەرهەمدارترین زانستیش ئەو زانستەیە، کە مەتن و ئەسـڵ و بنچینـەکانی دەرخ بکرێـت و بـیر لـە لـق و پۆپـەکانی بکرێتـەوەو سەرنجیان بدرێ، هـەروەها مـرۆڤ پـەلکێش بکـات بـۆ لای خـواو رەزامـەندی خوای تێدا بەدی بکرێ و دەستە بەر ببێ.[2]

## ٩-بە فیڕۆنەدانی کات و پارێزگاری کردنی ساتەکانی تەمەن:

کات (الوقت) گرینگیەکی بـێ وێنـەی هەیـە لـە ژیـانی تێکـڕای مرۆڤـەکان، بەتایبـەتی مرۆڤـی فـێرخواز و قوتـابی.. بۆیـە زەروور وایـە قوتـابی–زانسـتە شەرعیەکان– زۆر بە بایەخەوە بڕوانێتـە سـاتە وەختـەکانی تەمـەنی(سـاعات عمـره) بەباشـترین و بەسـوودترین سـەرمایەو دەسـتکەوتی ژیـانی بزانـێ و هەرگیز تاکە ساتێکی بێ سوود لێوەرگرتن بەڕێ نەکاو بە زایە نەدات..

بێگومان پەیامی پیرۆزی ئیسلامیش زۆر بە ڕێز و بایەخەوە ئەڕوانێتە کات و باسی لێوە دەکات، تا ئاستێکی وا پەروەردیگارﷻ سوێندی پێ‌ئەخوا وەك دەفەرمووێ: ﴿والعصر إن الإنسان لفي خسر..﴾.[3] هـەروەها پێشـەوا (علـی کـوڕی ئـەبی تـالیب) خـوا لێی رازی بێـت– بـەم شـێوەیە پێناسـەی کات(الوقت) دەکات، کە دەفەرمووێ: ((الوقت کالسیف إن لم تقطعه یقطعك)) واتە: ( کات وەکو شمشیر وایە گەر نەیبڕی دەتبڕی).

جارێکیان پیاوێك بە زانایەکی گوت: (قف أکلمك) واتـە: راوەسـتە هـەندێك قسەت لەگەڵدا بکەم، زاناکەش لە وەڵامدا فـەرمووی: (أوَقِـفَ الشـمس) واتـە:

---

١ - القمر/١٧

٢ - حلية طالب العلم ص /٣٩

٣ - العصر / ١-٢

ئایا خۆر وەستاوە– تامن بوەستم – بەڵێ کات لەسەر مرۆڤ ناوەستێ و هەردەم لەوەرزی بەسەرچوون دایەو سات لەدوای سات تەمەنی مرۆڤ لە کورتی دەدات و بەپیر تەواو بوونەوە دەچێت!

کەواتە خویندکاری دڵسۆز و بە مشور:

هەردەم دۆست و هاوەڵ و هۆگری کات الوقت بە وریابە گیرۆدەی دەردی کات بە فیڕۆدان و وبێکاری نەبیت، بەڵکو هەوڵدە بەپێی نەخشەو سیستەمی دابەش کردنی کاتەکان (توزیع الأوقات) وە دابەش کردنی کارەکان (توزیع الاعمال) هەڵس و کەوت بکەو کارو پیشەی شیاو و گونجاو و بەکەڵك دەست نیشان بکە بۆ پڕکردنەوەی ساتەوەختەکانی تەمەنت، هەروەها تۆ وەکو فێرخواز و خوێندکارێکی لاوی زانستە شەرعیەکان زەرورە تێبکۆشی و ڕەنج بدەی و بەرنامەیەکی تۆکمە و ڕێك و پێك دابڕێژی بۆ خۆڕۆشنبیرکردن و دەستخستنی زانیاری (العلم) بەهەموو ڕێگەو شێوەو جۆرەکانی وەك خوێندن و خوێندنەوەی پەرتووك و سەرچاوەی جۆراوجۆر و نایەب و بابەت (موضوع) گرینگ و بەسود و ئەزبەرکردن و سەرنج دان و تاد.

پێشەوا (علی کوڕی ئەبی تالیب)ش لەبارەی هزر و بیر دەوڵەمەند کردن و هاندان و پێشڤە چوون بەرەو ئاستێکی بەرزی زانستی دەفەرموێ : (هەموو دەفرێك بە تێکردن تەسك دەبێتەوە تەنها عەقڵ نەبێت؛ پێی فراوان دەبێت).

## تێبینیەکی گرینگ:

قوتابی بەڕێز:

مەرج نیە کردو کۆش و ڕەنجدان و زەحمەتکێشان بۆ دەستخستنی زانیاری (العلم) تەنهاو تەنیا پەیوەنداربێ بە پرۆگرام (منهج)ی قوتابخانەکانی –زانستە شەرعیەکان (مدارس العلوم الشرعيه) و لە چوارچێوەی ئەوانەوە دەرنەچێ و نەترازێ، بەڵکو زەرورەو پێویستە کەوا چۆن خوێندکار لە بوارەکانی (تەفسیر و فەرموودەو بیرو باوەڕ (العقيدة) و فیقە نحو و صرف و زمانەوانی بەلاغە و باقی زانست و وانە شەرعیەکانی تر شارەزاو بە ئاگایە، بە هەمان شێوە لە بوارەکانی (مێژو و پەروەردە و فەلسەفە و ڕامیاری و کۆمەڵناسی و تەندروستی و دەروون ناسی گەردوون ناسی و تاد، نابێ بێ ئاگا بێ و کەم تا زۆر لێیان نەزانێ و سەرەدەریان لێ دەرنەکات، چونکە زانایانی پێشوو لەم بوارانەش هاوکات لەگەڵ بوارەکانی تر ئەسپی خۆیان تاو داوەو جێ پەنجەیان دیارە و مێژووش شایەتیان بۆ ئەدا. بۆ نموونە:

یەك: پزشکیەتی –الطبابة–:

ئەو زانایانەی دەستی باڵایان هەبووە لەم بوارەوە ئەمانەی خوارەوە هەندێکیانن:

١– ڕازی: کە ناوی ڕاستەقینەی خۆی (ئەبو بەکر کوڕی محمد زەکەریا)یە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زایینیدا لە دەورو بەری شاری تەهرانەوە چاوی بە دونیا هەڵێناوە.. تەنها لە (طب)دا ((٢٢) پەرتووکی نووسیوە، کە بۆ چەندەها زمان و وەرگێڕدراون.

٢– ئیبن سینا: کەناوی ( ئەبوعلی حوسەین کوڕی عبدوڵلای کوڕی سینا )یە، ناوبانگی بە(ڕەئیس ) دەرکردبوو، ئەم کەڵە زانایەش زیاتر لە (١٠٠)

سەد پەرتووكی لە پزیشكی‌دا داناوە.

دوو: زانستی سروشت ناسی:

لەم بوارەشدا زانا موسڵمانەكان پشكی شێریان بەركەوتووە و دەوری باڵایان بینیوە وەك:

١- (ئیبنول هەیسەم): كە لە (٣٥٤) كۆچی‌دا لەدایك بووە و (٢٠٠) كتێبی داناوە، ئینجا لەم دووسەد كتێبە (٤٧) دەربارەی بیركاری (ریاضیات) و (سروشت ناسی) و (طبیعة) بوون و (٥٨) شیان ئەندازیاری.

٢- ( كەمالەددینی فارسی ) كە لەم بارەوە رۆڵی بەرچاوی گێڕاوە.

سێ: جوگرافیا:

١- (شەریفی ئیدریسی) : ئەم زانا بلیمەتە لە سەدەی یازدەهەمی زاینی‌دا لە دایك بووە..(جوتیە) لە وەسفی ئەم بەڕێزە دا ئەڵێت (مامۆستای هەموو ئەوروپا بوو لە جوگرافیادا..) هەروەها (ئیدریسی) كتێبیكی نووسی لە بابەت جوگرافیاوە لەبەر گرینگیەكەی وەرگێڕدرا سەر ئەم زمانانەی خوارەوە:

١- ئیسپان لە ساڵی (١٧٩٣) ز دا.

٢- ئەڵمانی ساڵی(١٨٢٢) ز دا.

٣- فەڕەنسی ساڵی(١٨٣٩) ز دا.

٤- ئیتاڵی ساڵی (١٨٨٥) ز دا.

٢- ئەبو ڕەیحانی بیرونی: ئەم زانایەش لەساڵی (٣٦٢) ك هاتۆتە دونیا (٧٥) ساڵ تەمەنی بووە، دەستی باڵای هەبووە لە (بیركاری و گەردونناسی و دەروون ناسی و زمانی بێگانە) هەر وەك چۆن لەبواری: (مێژوو و جوگرافیا)شدا ناوبانگی دەركردبوو لە جیهاندا[١].

---

١ - كەمێك بە دەستكاری‌یەوە لە ( سەرپەستی لە ئیسلامدا ) وەرگیراوە لاپەڕە/٤٠، ٤٢

بە تایبەت ئەو تەرزە ئایدۆلۆژیا و بیرو ڕا و ڕێبازە دەستکرد و خواستراوە بـە نـاو ڕامیـاری و هاوچـەرخ و پێشـکەوتن خوازانـەی، کـە دژایـەتی نـاکۆکی (تناقض) ێکـیان هەیـە لەگـەڵ ئیسـلامدا، چونکـە گـەر ماهیـەتی شـتێك یـان فکرەیەك نەزانێت و نەناسێت، چۆن و بەچ کلۆجێك بەر پەچی بدەیتەوە و بە خەڵکی بناسێنیت؟ بێگومان ناتوانیت.

وەك شاعیریش دەڵێت

عرفت الشرَّ لا للشر لكن لأتقيه    فمن لم يعرف الشر من الناس يقع فيه

چونکـە نـاکرێ و ناگونجـێ مـرۆڤ لـە واقیـع و ڕۆژگـاری خـۆی بـێ ئاگـاو نەشارەزابێت و دۆست و دوژمنی نەناسێت! ؟.

## بەشی سێیەم

## بەکار هێنان و بەکرداری کردنی زانست

ئەوەشیان بە ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە دەستەبەر دەبێ..

### ١-دەرك کردنی نیشانەکانی زانستی بەسود:

فێرخواز و فەقێی ئازیز: سەرنج بدەو پرسیار لە دەروونتدا بکە دەربارەی ئەوەی ئاخۆ تۆ تا چەند نیشانەکانی زانستی بە سودت بەدەست هێناون و هەتا چ ئاستێك توانیوتە زانستەکەت بخەیتە قالبی عەمەلی و لە گۆڕەپانی کاردا ڕۆڵی کاریگەری خۆت ببینی گۆڕانکاریی بەر چاو و بێ وێنە لە نێو جەرگەی کۆمەڵگادا بخولقێنی، کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لە نیشانەکانی، بۆ وێنە:

یەك: کارپێکردن و جێبەجێکرنی زانیاری بە شێوەیەکی عەمەلی (العمل به).

دوو: ڕقبوونەوە و حەز نەکردن لە خەسڵەتەکانی: خۆپەسندی و مەدح و بە شان و باڵ هەڵا گوتن و خۆبەگەورە گرتن (التکبر علی الخلق):

سێ: تا ئاستی هۆشیاری و زانستیت زیاتر و بەرزتر بچێ، زیاتر و چاکتر بێ فیزی و ملکەچی بنوێنی و خۆ هەڵکێشانت نەبێ.

چوار: دوورەپەرێزی و دوور کەوتنەوە لە خۆشەویستی خۆدەرخستن (حب الظهور) و زەعامەت و مەسئولیەت و شورەت و ناودەنگی دونیا.

پێنج: بانگێشە (ادعاء) نەکردنی زانایی خۆت و خۆ بە زاناو لێهاتوو نەژماردن.

شەش: بەد گومانی و گومانی خراپ (سؤ الظن) بە خۆبردن، هاوکات لەگەڵ گومانی چاك (حسن الظن) بە خەڵکی بردن، تاکو پارێزراو بێت لە بە خراپ باسکردنیان و گومانی خراپ پێ بردنیان.[1].

## ٢- زەکاتی زانستەکەت بدە:

زانست ئەو نیعمەتە پیرۆزەو بەفەڕەیە، کە خوای گەورە بە فەزل و بەخششی خۆی ئەیبەخشێ بەو مرۆڤەی ویستی لە سەر بێت، بۆیە پێویستە قوتابی موسڵمان لە هەمبەر ئەو نیعمەتە بەرز و گران بەهایەدا وەکو دەربڕینی سوپاس و نواندنی شوکرانەبژێری بۆ خوا زەکاتی زانستەکەی دەر بکات..

بە شێوەکانی ڕاگەیاندنی حەق و ڕەوا و بانگەوازی بۆ پەیامی خواو فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگرتن و پەرچ خستنە بەردەم خراپە و گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەو خزمەت بە زانیاری و سوود گەیاندن بە خەڵکی و پشتیوانی و بەرگری کردن لە ئیسلام و موسڵمانان و بەرپەچدانەوەی ناحەزان لە کاتی پێویستی دا.

ئەبو(هریرە) خوا لێی ڕازی بێ لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((إذا مات الإنسان انقطع عمله الا من ثلاث, صدقة جارية، أو علم ينتفع به, أو ولد صالح يدعوا له))[2]..

---

١ عبدالله ی کوڕی مبارك، گەر کەسێك باسی زانایەکی پێشینی (سلف)ی لەلا کردبوایە ئەیفەرموو: ( لاتعرض بذكرهم مع ذكرنا ليس الصحيح إذا مشى كالمقعد ) حلية طالب العلم. ص/ ٥١

٢ صحيح مسلم ١٦٣١

بەشێك لە زانایان فەرموویانە: ئەم سێ یانـە – بە دەستە جەمعی لە هیچ کەس کۆ نابنەوە، مەگەر بۆ زانایەکی وا کە زانیاریەکەی دەبەخشێ چروکی پێ ناکات هەڵبەتـە بەخشینی زانستیش چاکە (صدقـة) یەکـە سوودی لێ ئەبیندرێ، هـەروەها ئەو قوتـابی و فێرخوازەش کە زانستەکەی لێوەردەگرێت و فێردەبێت، بـە ڕۆڵـەی (ولـد)ی زاناکـە لـە قەڵـەم دەدرێ– مەبەست ڕۆلەی زانستییە–.

جا کەوایە فێرخوازی فەقێی ژیرو مەند:

سوور بە لەسەر ئەم خەسڵەتە بەرزەو پێیەوە پابـەند بە، کە پاراستن و بەرهەمدار بوونی زانستی لێوە بە بەرهەمدێت، چونکە زانیـاری تـا بیبەخشی زیاتر گەشە دەکـات و زیـاتر دەبێـت، بـەڵام بـە پێچەوانـەوە بڵاونەکردنـەوەو کپکردنـی زیانبەخشـترین دەردو کاریگـەرترین میکـرۆب و ڤایرۆسـێکە، کـە دووچاری زانست دەبێت و بەرەو کەمکردنەوەو بە فەتارەتچوونی دەبات.

خوێندکاری زانست پەروەر:

وریا بە ئەم جۆرە قسەو قسەلۆکانەی خەڵکی دۆڕاو و ورە داتەپیو و دونیا ویسـت کـارت تـێ نەکـەن، کـە دەڵێـن: ئاخـیر زەمانـەو سـەردەمێکە خراپـە دەستی سەندووە و بێدین و خراپەکار و زۆرداران زاڵ و دەست ڕۆیشتوون و ئامۆژگاری کەڵکی نەماوە، بە تەنها ڕاگـەیاندنێکی سـەرپێیی ئـەوێ و هتد.

تۆش نەیانکەیت بە پاساو و بیانوو بۆ پاڵدانەوەو مشوور نـەخواردن و خـۆ بـە بەرپرسـیار نـەزانین، چونکـە ئەگـەر وا بکـەیت خـوا نەخواستە– ئـەوا دوژمن و پیلانگێڕ و قین لە دڵانی بەرامبـەر ئـەم ئایینـە مەزنـە لـە پێنـاو ئـەو کـارەی تـۆ زێـڕی سـوور ئەبەخشـن و بـازاڕی پێئـەدەن، تـاکو تـەواو تـەواو

خەڵکی موسڵمان دەسبەرداری ئەم پەیامە خواییــە دەبن و پیلان و نەخشە گــڵاو و شــەڕانگێزەکەی ئــەوانیش ســەردەگرێ و بــەردەگرێ، ســـەرەنجام بەیداخی زانست ئایین پەروەری ئەخرێتە زەوی و ئاڵای بەدڕەوشتی و خراپــە و ریسواکاری بەناوی پێشکەوتن و دوانەکەوتن لە پێشڤەچوونی رەوڕەوەی مێـژوو و دەیـەها دروشمـی تـری فریـودەرو بـێ نـاوەڕۆك و فابریقـەداری لــەم شێوەیە- بشەکێتەوە[1] ! !

### ٣- عیززەت و سەربەرزی زانایان:

خۆڕازاندنـەوە و خــۆ چــەکدارکردن بــە خەسـڵەت و چــەکی عــیززەت و سەربەرزی گونجاوترین و لەبارترین کارێکــە بـۆ پاراسـتن و بەگـەورە و بـەڕێز راگرتنی زانیاری و باشـترین پارێزەریشـە بـۆ قـەدرو رێـز و شـکۆیی زانسـت و زانایـان، بـە ئـەندازەی نوانـــدن و بــەجێهێنانی ئــەم رەوشــتە، عــیززەت و شکۆمەندیش دەستەبەر ئەبێ و بەدەست دەهێندرێ .

بۆیە دەبێ فێرخواز فەقێی زانستە شـەرعیەکان- زۆر بـە ئاگـاو وشـیار بێ لە ئاقار زۆردار و خۆبەگەورەگر و خۆبەخوازانان، نەبادا بیکەن بە ئامراز و وەسیلەی دەستخستنی ئاوات و ئامانج و بەرژەوەندییــە شەخسـی و مـەرام و ئارەزووە ناشـەرعیەکانیان، تـاکو شـەرعیەت بـە کـارە دزێوەکانیـان بـدەن و دەورو بەریش فریو بدەن!

یاخود نـەفام و دونیـا پەرسـتان بیخەنـە داوی تـەفرەو پـێلادان، دوایـش بکەویتە ژێر کاریگـەری ئـەوان و نـەرمی بنوێنـی لـە:( فتـواو بڕیـاردان و یـان هەڵوێست دەربڕین ووتاردان و . هتد.

---

١ - حلية طالب العلم: ص/ ٥١

*قوتابی بەڕێز:* ڕەزامەندی و ڕازیکردنی خەڵکی و دەورو بەرو دونیا ویستانت مەبەست نەبێ و هەوڵی بۆ مەدە، چونکە مرۆڤی موسڵمان بە تەنیا حساب بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خوای باڵادەست دەکات و ئەمە بە ئامانجێکی بنەڕەتی دەزانێ، گوێ نادات بە گلەیی و گازاندەی ئەم و ئەو، چونکە چاك لەم ئایەتە پیرۆزە گەیشتووەو پێی گۆش کراوە، کە دەفەرمووێ: ﴿... والله ورسوله أحق أن يرضوه إن كانوا مؤمنين.﴾.[1] بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەڵس و کەوت دەکات و لە گۆڕەپانی ژیاندا دەست بەکار دەبێت بێگومان ڕازی کردنی هەموو خەڵکیش کارێکی تا بڵێی ئەستەم و مەحاڵە، چونکە هەریەکەی بەشێوەیەك بیر دەکاتەوە و هەڵوێست دەردەبڕێت، چونکە سروشتیان لە یەکتر جیایە، بۆیە ئەبینین مێژووی مرۆڤایەتی بە گشتی و مێژووی ئیسلامی بەتایبەتی سەرگوزشتەو بەسەرهاتی کەڵەپیاوانێکی لە خوا ترس و بوێر و بە هەڵوێستی تۆمار کردووە و ڕووە ڕەنگینەکانی خۆی پێ نەخشاندووە، کەوا دڵە گەورەکەیان پڕبووە لە ئیمان، هەرگیز گوێیان بە پلەو پایە و خۆشگوزەرانی نەداوە و سەری بەرزیان بۆ هیچ زۆردارو تاغوتێك دانەنواندووە، لە گەڵ ئەوەی زۆردارانیش لەوپەڕی هێزو دەسەڵات بوون، بەردەوامیش هەڵوێستی مەردانەو جوامێرانەیان هەبووە، دژ بە ستەم و زۆرییان وەستاون و بەرەنگاریان بوونەتەوە.. کەچی بێجگە لەچەکی بیروباوەڕ- زۆربەی جاران- چیتریان شك نەبردووە، بێگومان مرۆڤی باوەڕداریش هەر بەم چەکە ناوازەیە، باڵادەست و دەست ڕۆیشتوو زاڵ دەبێت بەسەر تێکڕای چەك و هێزە هەمە چەشن و جۆراو جۆرەکانی تر.. هەڵبەتە ئەم پێشەوا فیداکار و بەجەرگانەش – وەك

---

١ - التوبة/ ٦٢

خەڵکانی تر– دەیانتوانی بە جۆرێك لە گەڵ فەرمانڕەوا و کاربەدەستە زۆردار و لاسارەکانی سەردەمی خۆیان هەڵبکەن و مەدار بکەن و خۆ بگونجێنن، بەڵام چاویان نەبڕیوەتە خۆشگوزەرانی و ماڵ و سامانی زۆرو ئافەرین و دەستخۆشی ئەم و ئەو هتد.

لە خولیای ئەمەدا نەبوون و تەنانەت دەتوانین بڵێین– بیریشیان لەمە نەکردۆتەوە– چونکە بە کارێکی ڕەواو شەرعیان نەزانیوە وەك بە ناو زاناو پێشەوا خراپەکار و دونیا ویست و ئارەزوو پەرستەکان– لەسەر حیسابی دین بۆ پەیداکردنی پارووی چەوری ئافەرینی ژین خۆیان بکەن بە مەقاشی دەستی زۆردار و خۆ بەزاڵ زانانی بێدین!!. هەروەها لەبەر ئەوەی ئەمانە تەواو تەواو خۆیان بۆ خواو خزمەت بە ئایینی خوا یەکلا کردبووەوە، تەنانەت کاریان بە بنەمای روخسەت– یش نەکردووە بەڵکو بە پێی بنەمای عەزیمەت– هەڵس وکەوتیان کردووە، چونکە بە خۆیان ڕەوا نەبینیوە مادام لە پلەی پێشەواو پێشەنگیەتی دابن کار بە روخسەت بکەن. بۆیە کارێکی ئەستەمە کەوا دونیا و فاك وفیکی زۆرداران فریویان بدات و بیانخەڵەتێنێ پاشانیش بە فیتی ئەوانەوە بجووڵێن..

*جا بەڕێزەکانم:*

هەڵوێستی زانا بەجەرگ و جوامێر و دڵسۆز و بە پەرۆش و خوا ویست و مەیدان ویستەکان، هێندە زۆرن ڕەنگە نەتواندرێ لە دەرفەتێکی ئاوا کەمدا بخرێنە ڕوو و باسیان لێوە بکرێ، بۆ یە تەنها بە چەند نموونەیەك وەك گوڵبژێرێك– واز دێنین و ئیکتیفا دەکەین کورد گوتەنی: ( مشتێك نموونەی خەروارێکە) جا فەرموون ئێوەو هەندێ لەم هەڵوێستە بوێرو بەرز و شکۆدارانە:

یەکەم: تاکە هەڵوێستێکی جوامێرانەی پێشەوا (ئەبو حەنیفە)خوا لێی ڕازی بێ؛-

لە سەردەمی -ئەبو جەعفەری مەنسور- بە بڕیارێکی -ئەبو جەعفەر- جارێکیان ئەبو حەنیفە دەسگیرکراو زیندانی کرا پاش بینین و چەشتنی جۆرەها ئازار و ئەشکەنجەی بێ رەحمانە، کە بە بڕیاری خودی فەرمانڕەوای ناوبراو بینی بووی، دایکی هاتە سەردانی لە زیندان بەم شێوەیە هاتە ئاخاوتن لە گەڵیا: (( یا نعمان ان علماً ما أفادك غير الضرب و الحبس لحقيق بك لتنفر عنه)) واتە: ئەی نوعمان عیلم و زانستێك، کە بێجگە لە لێدان و تێهەڵدان و زیندانی کردن بەم لاوە بۆتۆ کەڵکی تری نەبووبێ مافی خۆیەتی بەم لاوەی بنێی و وازی لێبێنی.. پێشەوا ئەبو حەنیفەش لە وەڵامدا بە دایکی گوت: ( يا أماه لو أردت الدنيا لوصلت إليها، ولكن أردت أن يعلم الله إني صنت العلم ولم أعرض نفسي فيه للهلكة) واتە: دایە گیان ئەگەر من مەبەستم دونیا بوایە ئەوا بێگومان دەگەیشتم بە مەبەستەکەم، بەڵام تاکە مەبەست و ئاواتم ئەوە بووە .. کە خوای زانا پێ ئاگادار بێ کەوا عیلم و زانیاریم پاراستووە، بەبێ گوێدانە نەفسی خۆم، کە ئایا دووچاری زیان و هەلاکەت دەبێ یاخود نا. ! ؟.

دووەم: پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) خوای لێ ڕازی بێت -:

ئەم پێشەوا بەرزو بە جەرگەو بە هەڵویستە کاتێك کەوا مەئمون ی فەرمانڕەواو پشتگیری تاقمی موعتەزیلە کانی دەکرد دژی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەربارەی داننان بە بیرۆکەی خەڵقی قورئان لەو کاتە ناسکەدا ئیمامی دڵسۆزو خەمخۆری سوننەت و دوژمنی سەرسەختی بیدعە هەروەك شاخێکی بەهێز و سەرکەش،بێ گوێدانە جۆرێك لە ترس و

تۆقـاندنی فـەرمانڕەوا و زەبـر بەدەسـتان، لـە شـێوەی مرۆڤێکـی خۆڕاگـرو هەڵوێست بەرز لە بەرامبەریاندا وەستاو بەرەنگاریان بوویەوە، بـە شـێوەیەك بەشـێك لـە قوتـابی و دۆسـت و هۆگـرو نزیکـانی خـەمیان بـۆ دەخـوارد و هەڵوێستەکەیان بە مەترسیدار بۆ خـودی پێشـەوا لـە قەڵـەم دەدا، ئـەوەبوو جیارێکیان ئیسحاقی مامی هاتە سەردانی و پێی گـوت: (یا أبا عبدالله قد أجاب أصحابك، وقد أعذرت فیما بینك و بین الله، وبقیت أنت في الحبس والضیق) واتە: باوکی عبداللـە: ئـەوا هـەموو هاوەڵـەکانت لـەم شـتە بێدەنـگ بوون و هەڵویستیان نیە، تۆش عوزرت بۆ نێوان خۆت و خودا هەیە، بەڵام تـۆ بەتەنها لە تەسکی و ناڕەحەتی زینداندا ماویتەوە!.

–ئیمامی جوامێریش لە وەڵامی مامیدا فەرمووی: (یاعم إذا أجاب العالم تقیة، والجاهل یجهل فمتی یتبین الحق) واتـە: مامـەگیان: جا ئەگـەر زانـا بـە شێوەی (تقیە)[1] وەڵامی دایەوەو نەزانیش نەزانێ، چۆن و کەی حـەق و ڕەوا دەر دەکەوێ و ڕوون دەبێتەوە؟!.

سێیەم: (ئەبو عباسی بەغدادی) کە پێیان دەگـوت شـافیعی گچکـە –(الشافعي الصغیر):

لە ژیاننامەکەیدا هاتووە کەوا فەرمانڕەواو کاربەدەستانی سـەردەمی ئـەو، زۆر گرینگیان پێ دەدا.. چونکە تا بڵێی بابایەکی زاناو مەردو مەند بـوو، تـا ئەوە بوو دەستنیشانیان کرد بۆ وەرگرتنی پلەی (قاضي) یەتی

بەڵام ئەویشـیان وەك هـەر داعـی و بانگبـەرێکی خواویسـت و خۆنەویسـت بەرەنگاری ئەم بڕیارە بوویەوە و ئامادە نەبوو ئەم ئەرك و پلەیە لـەو سوڵتە و دەسەڵاتە ناشەرعیە وەر بگرێ..

---

١ – وشەی (تقیة) شێوە دەربڕینێکی ناڕاشکاوی و بە پێچ و پەنایە وشاردنەوەی مەبەستی تیایە.

بۆیە زەبر بەدەست و کار بەدەستێکی ئەوکات پـێی گـوت: گوێڕایـەلیمان دەکەیت و بەر پرسیاریەتەکە وەردەگری بێ زۆری لیٚ کـردن، ئـەگینا ناچـارت دەکەین بەزۆری بەسەرتا ئەسەپێنین.. لە وەلامیدا زانای پایەبەرز فیداکـار ( ئەبو عەبباس)– فەرمووی: (إفعل ما بدا لـك) واتـە: چیـت لـە لەدەسـت دێت بیکە! هەر ئـەوەی دووبـارە دەکـردەوە تـا دەرگـای لەسـەر گالـەدا.. ئینجا لەسـەر ئـەم هەلوێسـتە خـەلکی گلـەیی و گازاندەیـان لیٚ کـرد و ڕەخنـەیان لیٚ گرت، زانای ناوبراویش لە وەلامی یان دا ئەی فـەرموو: تەنـها ویسـتم خـەلکی بزانن وگوێ بیست بن، کە پیاوێك لە هاوەلانی (شـافعی) ئـاواو ئـاوای لەگـەل کرا لەسەر ئەوەی پلەی قازییێتی (القضاء) وەر بگرێ کـەچی ئـەو هـەر مکـور بوو لە سەر وەرنەگرتنی پلەکە بەهۆی دونیا بەکەمگرتنی (زهدی)یەوە[1].

چوارەم: خەتیبی بەغدادی (الخطیب البغدادي):

لـە ژیاننامـەی ئـەو پێشـەوا بـەڕێزەش هـاتووە، کـەوا جارێکیـان چـەند عەلەوییەك دێنە خزمەتی و یەکێکیان کە هەندێك پارەی لەدەست گرتبوو بە خەتیبی گوت: فلان کەس سلاوو ڕێزی هەبوو بۆ جـەنابت و گوتیشـی بـا ئـەم بڕە پارەیە لە پێویستییەکانی خەرج بکا!؟.

خەتیبیش فەرمووی بەسەر بلندییەکەوە (پێویستیم پێی نییە)

عەلەویەکـەش وازی نـەهێناو گوتـی: چـۆن پێویسـتیت پـێ نیـە، دەسـت بەجێش پارەکە ناو دەستی کـردە سـەر بەرمالەکـەی بەردەمی و دینارەکـان کەوتنە سەری و گوتی: فەرموو ئەوە (٣٠٠) دینارە بۆ خۆتی خەرج بکە، ئـەم جارەیان بەم کارە هەندەی تر خەتیب قەلس و تووڕە بوو و سـوور هەلگـەڕا، هەلسا بەرمالەکەی گرت و هەلی تەنکاندە سـەر زەوی و– بـە تووڕەییـەوە

---

[1] - المصفى من صفات الدعاة، الكتاب الأول،ص/٤٢

له مزگەوت چووە دەر

بێگومـان ئـەم کـارەی خـەتیب هەڵتـەنکاندنی بەرماڵەکـە کـە تەنـها خولەکێکی نەخایاند، کەچی شوێنکەوتەو قوتابیانی خەتیب، کە ئەو سات لـە مزگـەوت ئامـادە بـوون بـەچاوی خۆیـان هەڵوێسـتە بـەرز و بـێ وێنەکـەی خـەتیبیان بینـی، دەسـت بـەجێ کـاری کـردە سـەریان و رای هێنـان و پەروەردەی کردن لەسەر مانا پیرۆزەکانی رەوشتی عیززەت و بەپووچ و بێ نرخ تەماشاکردنی بەندایەتی بۆ غـەیری خـوا، ئەمـەش لـە وتـەی یـەکێکیاندا دەردەکەوێ، کە دەڵێ: ( ماأنسى عـز خـروج الخطيـب وذل ذلـك العلـوى وهـو قاعد على الأرض يلتقط الدنانير من شقوق الحصير ويجمعها)[1] واتـە: هـەرگیز سـەربەرزی و عـیززەتی خـەتیب کاتـێ لـە مزگـەوت بـە سـەربلّندیەوە چـووە دەرەوە، لـەیاد ناکـەم و بـیرم ناچێتـەوە، هـەروەها ریسـوایی و زەلیلـی ئـەو عەلەویيە کاتێك دانیشتبوو لەسەر زەوی یەکە یەکە دینارەکانی لەنێو کون و کەلەبەرەکانی رایەخ و حەسیرەکە هەڵ دەگرتەوە.

پێنجەم: عیززی کوڕی عەبدولسەلام:

ئەم زانابەرزە پاش ئـەوەی شـا ئـەیوبی سـاڵح داوەتـی کـرد و شـێخ بووە میوانی لە وەڵاتی (میسر) پاش ئـەوەی لـە(شـام) دەرکرابـوو لەبـەر بـە هەڵوێستی و حەق ویستی و بوێرییەوە

ڕۆژێکیان (ئەیوب شا) لـە کـۆڕ مجلس ێك دابـوو کـەوا چـوار دەوری چنرابوو بە فەرمانڕەوا و ئەمیر و کاربەدەستەکان، خـەڵکیش کۆمـەڵ کۆمـەڵ دەهاتنە لای دەستیان ماچ دەکردوو سەریان بۆ دادەنواند، جا لەم کاتـەو لـە نێو ئەم هەموو حەشامەتە و کەین و بەینەدا پێشەوای فیداکار و دلێر (عیززی

---

١ - المصفى من صفاة الدعاة ، الكتاب الأول ، ص/٤٠

کوڕی عبدالسلام) ریزەکانی بڕی و هاتە پێش و بەو پەڕی هێزی باوەڕەوە بە ڕووی پادشای ناوبراو هاواری کردوو فەرمووی: بۆچی مەی (خمر) لە سەردەمی تۆدا بە ئازادی دەفرۆشرێ و تۆش لە نێو ئەو هەموو نازو نیعمەتەدا خافڵاوی؟!..

(شا ئەییوب)یش لەوە زیاتری بەدەست نەما، کە بەو پەڕی نەرم ونیانییەوە داوای لێبوردنی لیٚ بکات! پیٚی گوت: من بەمەم نەزانیوە.. ڕەنگە لە سەردەمی باوکم دابوویێ، بەڵام پێشەوای ناوبراو بەوەندە وازی نەهێناو تەنانەت ئەم جارەیان بە شێوەیەکی توندتریش دووبارەی کردەوە و فەرمووی: لەوانە کەمترت نەگوتووە کە دەڵێن: ﴿ إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم مقتدون ﴾،[1] جا پاش ئەمە پاشا بڕیاری داخستنی مەیخانەکەی دەرکرد، لە دواییدا یەکێك لە نزیك و دەست و پەیوەندەکانی پاشا لیٚی ئەپرسیٚ: ئەریٚ تۆ لیٚی نەترسای؟ شێخ لە وەڵامیدا فەرمووی: ڕۆڵە سوێند بە خوا کاتیٚ کە بیرم لە هەیبەتی خوای باڵا دەست کردەوە، پاشام لە پێش چاو بە شێوەی پشیلەیەك بچووك بوویەوە!.

شەشەم: مامۆستاو قارەمانی کورد ( سەعیدی نورسی) کە ناسراوە بە (بدیع الزمان):

مامۆستا (سعید نورسی) لەساڵی (١٢٩٣)ك بەرامبەر (١٨٧٣)ز لە دێیەکی سەر بە قەزای (هیرات) لە ناوچەی (بتلیس) ی کوردستانی تورکیا لەدایك بووە، هەڵبەتە دایك و باوکیشی کوردن و گەورەبووی ناوچەی ناوبراون..

مامۆستا هەر لەزووەوە ئاشنایەتی پەیداکردووە لە گەڵ ڕێبازی زانست و

---

١ - الزخرف، ٢٣

زانست پـەروەریدا، لـە تەمـەنی (٩) سـاڵیدا، ڕووی کردۆتـە خوێنـدن، لـەژێر چاودێری و سەرپەرشتیاری (مەلا عبدالله)ی برای مامۆسـتا تـا بلێـی زیـرەك و لێهاتوو و هۆشیار بوو، بۆیە لە ماوەیـەکی زۆرکـەم لـە تەمـەنی (١٨) هـەژدە ساڵی دا لە سەرانسەری تورکیادا ناوبانگ و شۆرەتی دەرکـرد، لـە ڕیـزی زانـا وشـیار و بـە توانـا و بلیمەتـەکان لـە قەڵـەم درا، هـەروەها تـا ئـەو قۆناغـەی تەمەنی هەموو زانستەکاتی (نحو، صـرف، بلاغـە، فلسفە، زانیـاری، (أصـول الفقـە)، زانسـت (علـوم)ەکـانی قورئـان (فقـە)یشـی هــەموو خوێندبـوو، بـە شـێوەیەکی وا کـە هـەموو بابەتـە گرینگـەکانی ئەزبـەر کردبـوو، بـۆ نموونـە (قاموس المحیط) ی تاپیتی (س) لەبەر کردبوو، پەرتووکی بەناوبانگی (جمـع الجوامع)ی لە زانستی (أصـول الفقـە) دا تەنـها بـەڵێ تەنـها بەیـەك تاکـەمانگ لەبەر کرد.

ئینجـا فـەقێی ئـازیز: پـاش پێشـکەش کردنـی ئـەو پێشـەکییە کەمــەی سـەرەوە، کـە بــە مەبسـتی پێناسـاندنێکی کـەمی مامۆسـتا (نورسـی) خستمانەڕوو، فـەرموون ئێـوەو هەڵوێسـتێکی ئـەو پێشـەوایە، کـە بریتیـە لـە هەڵوێستێکی جوامێرانەی لەگەڵ (ئەتاتورك)دا:

لە ساڵی (١٩٢٠)ز مامۆستا نورسی بانگ کرا بۆ ئەنقەرە بـۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگێکی گەورە، کە دام و دەزگانی ئەتاتورك سازیان کردبوو ، ئیجـا لـە میانەی ئاهەنگەکە مامۆستا بۆی دەرکەت، سازدەرانی ئەم ئاهەنگـە گشـتیان نەیاری ئیسلامن و خەریکی نەخشە و پیلانــی گـڵاون دژی گـەلانی موسـڵمان، بۆیە شێر ئاسایانە لەنێو گەرمەی ئاهەنگەکەدا هەستا و چووە دەرەوە، پاش ئەمە بەیاننامەیەکی چڕو پـڕی هەڕەشـە ئـامێزی بۆ ئـەندامانی ئەنجوومـەنی نیشتەجێی (أعضاء المجلس النیابي) ڕەوانە کرد، کە لە لایەن خودی ( کمـال

ئەتاتورك)ە وە سەركردایەتیان دەكرا، شایەنی باسە بە بەیاننامەكەش چەند ئامۆژگاریەكی لە نێوان خۆ گرتبوو، كە بریتی بوو لە (١٠) برگە، سەردێرەكەشی بەم رستەیە دەست پێ كردبوو:- (إعلموا أيها المبعوثون إنكم مبعوثون ليومٍ عظيم).[١] ئینجا بەیاننامەكە بۆ ئەندامان خوێندرایەوە لەلایەن (كاظم قرەبكرە) دیارە بێگومان كاریگەریەكی سەرسوورهێنەری هەبوو، ئەوە بوو سەرەنجام شەست ٦٠ كەس لە ئەندامانی ئەنجوومەنی ناوبراو پاشە كشەیان كرد و بوونە موسڵمانێكی ڕاست و ڕێك و تەواو و شاگردێتی قوتابخانەكەی مامۆستایان قبوڵ كرد[٢] ! ؟.

## ٤- لە هەوڵی پارستنی زانستدا بوون نەك پارێز لە پلە و پایە:

فێرخوازی ئازیز: ئەگەر لە ژیانتدا دەستت گیر بوو لە هەر جۆرە پلەو پایە(المنصب) ێك غروری نەتگرێ و دڵنیا بە تاكە هۆ و ئامرازێك كە تۆی بەم ئاستە گەیاندبێت بە فەزڵی خوا پاشان بە هۆی زانست و زانستخوازیەكەتەوەیە، لەشان و باڵی خۆت مەزانە جا چ پلەی فێركاری (التعليم) یان فەتوادان و یان هتد ، ئینجا قەدرو ریزی زانستەكەت بزانە و بیپارێزە بەكار پێ كردنی. هەروەها بیكە بە ئامرازیك بۆ دەستخستنی رەزامەندی خودا، لە هەوڵی پاراستن و پارێزلێكردنی زانیاریەكەت بە، نەك پارێز لە پلە و پایە بكەی بە ئاوات و ئامانجێكی بنەڕەتی و ئەمە بەكاری سەرەكی خۆت بزانی و ئەولەویەتی پێ بدەی وەك ئەو جۆرە بەناو زانایانەی كە هەموو ئامانج و خەون و خەیاڵێكیان پاراستنی مەنسەب و پلەو پایەیانە بە شێوەیەك هەمیشە زمانیان گاڵەداوە و تاكە وتەیەكی ڕەوا (حق)

---

١ - وشەی ( مبعوث ) بە عەرەبی لە توركیادا لە جیاتی وشەی (نائب) بەكاردەهێنرێت.

٢ - سەرچاوە پەرتووكی (مامۆستا سەعید نورسی) لە نووسینی هێمن عەزیزی.

و هەڵوێستێکی مەردانەیان لێ نابیسترێ و چاوەڕوان ناکرێ، چونکە خۆشەویستی دونیا بە شێوەیەك بەرچاوی لێڵ و تاریك کردوون و زاڵ بووە بەسەر دڵ و دەروون و ئەندێشەیان، تەنانەت ئامادەن لە پێناویدا هەموو شتێکی پیرۆز بکەن بە قوربانی، خوا پەنامان بدا ئەگەر ئاین و باوەڕیشیان بێت..

خوێندکاری بەرێز و فێرخوازی شیرین:

کەواتە بەپەرۆش بە و مشوور لەپاراستنی رێز و قیمەتی خۆت بخۆ چاك چاك بیپارێزە، واتە ئاین و بیر و باوەڕ و زانیاری و شەرەف و رێز و بەهای خۆت لەدەست مەدە و بەنرخێکی هەرزان و کەم مەزاتی مەکە و سەوداو مامەڵەی پێ مەکە، بە وریایی و لێزان و ژیرانە،بەم مەبدەئە پیرۆزە هەڵس و کەوت بکە، کە رابەری مرۆڤایەتی محمد ﷺ دایڕشتووەو نەخشەی کێشاوە کە دەفەرموێ: (( أحفظ الله يحفظك, أحفظ الله في الرخاء يحفظك في الشدة...)).

ئینجا ئەگەر بەهۆی ئەم هەڵوێستەشتەوە دوچاری گرفتی دابەزاندن و دوورخستنەوە بووی لە پایەکەت چونکە حەتمەن ئەمە سەرەنجامی خۆبەدەستەوەنەدان بە هەڵوێستی‌یە دڵتەنگ مەبە و گوێی پێ مەدە، چونکە ئەمە سەربەرزی و شکۆمەندی‌یە بۆ تۆ نەك زەبوونی و ناتەواوی و شەرمەزاری!.

## ٥- پەرتوکخانەکەت:

خەسڵەتێکی تری قوتابی زانستە شەرعیەکان دەستنیشان کردنی پەرتووکخانەیە، پەرتووکخانەیەکی وا، کە سەرجەم بابەت و باسە زانستیەکان بگرێتە خۆ، واتە هەمەلایەن بێت..

چونکه بێگومان مرۆڤ چەند پێویستی بە هەناسەدان هەیە هێندەش بە زانست، هەڵبەتە ڕێز و بەهای زانستیش بە هۆی هەبوونی سوود و کەڵکی بێ سنووریەتی بۆ کۆمەڵ، کاتێکیش سوودو کەڵکی دەستەبەر ئەبێ، کە مرۆڤ ڕێگاکانی پەیداکردنی بگرێتەبەر و گرینگی پێ بدات، ئینجا بێگومان ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی دەستخستنی زانیاری هەبوونی پەرتوکخانەیەکی هەمەلایەن و دەوڵەمەندی وایە،کەوا لەکاتی تێنوەتی و ئاتاجی مرۆڤ بۆ هەر بابەتێك فریای مرۆڤ بکەوێ و تێنوەتی‌یەکە بشکێنێ و ئاتاجیەکە جێ بەجێ بکات

بۆیە ئەگەر سەرنجێکی مێژووی فێرخوازانی ڕەسەن لە کۆن و نوێ وە بدەین دەبینین لەگەڵ گەورەبوون و هەست وناستی زانستیان، ڕۆژ بەرۆژ بیرۆکەی پەیداکردن ودامەزراندنی پەرتووکخانەیان لا گەڵاڵە بووە و لە پێناویدا هەوڵ و ماندوبوونی زۆریان داوە، بە کۆکردنەوەی پەرتووك و دەوڵەمەند کردنی مەکتەبەکەیان بە سەرچاوەی جۆراوجۆر و هەمەڕەنگ

ئینجا چونکە زەرورە سەرچاوەی زانستی سەرچاوەیەکی پاك و بێگەرد و متمانە پێکراو بێ، بۆیە پێویستە پەرتووکی متمانە پێکراو (موثـوق) و بەکەڵك و پێویست نەبێ مەکتەبەکەتی پێ مەگرەو قەرەباڵغی مەکە و هزرو بیرت بە جۆرە پەرتووکی ئاخنراو بە ووتە و بابەتی پووچ و بێ مانا و بێ بەڵگە و دوور لە واقیع سەرقاڵ مەکە و کاتە پیرۆزەکانی تەمەنیشت بەم شێوە کتێبانە مەفەوتێنە.

*جا فەقێی بەڕێز:*

تاکو بتوانیت سەرچاوەی خاوێن و لەبارو گونجاو بەدەست بهێنیت ئەم چەند ڕێنماییانەت دەخەینە ڕوو بە ئومێدی کەلك لێ وەرگرتنیان:-

یەك: پەرتووكەكان بە نووسەرەكانیان هەڵ بسەنگێنە:

واتە: پێوستە بەر لەوەی بیر لە پەیداكردنی پەرتووكێك بكەیتەوە بتەوێ هەڵیبژێری و بیكەیت بە ئەندامێكی خێزانی مەكتەبەكەت، شارەزاییەكی تەواوت دەربارەی نووسەرەكە هەبێت و چاك هەڵیسەنگێنیت ئینجا مافی خۆتە سوود لە بەرهەمەكانییەوە وەرگریت و لە لیستی رێنمویكاران و مامۆستایانی خۆت هەژماری بكەیت، بۆ نموونە وەك ئەو زانا بەرێز و روناكبیرو پایە بەرزانەی خوارەوە:-

پێشەوا (نووي)، إبن قدامه، إبن كثير، إبن حجر، الشوكاني، إبن تيميه، إبن القيم الجوزي، سيد قطب، محمد قطب، صلاح عبالفتاح الخالدى.. هتد خوا لە هەموویان ڕازی بێ پلەیان لای خوا بەرزتر بێت.

دوو: هیچ پەرتووكیك مەخەرە نێو مەكتەبەكەت تاوەكو چاوێكی پێدا نەخشێنیت و سەرنجێكی نەدەیت، ئەوەشیان بەم شێوەیەی خوارەوە دەكرێ:

أ- خوێندنەوەی پێشەكییەكەی (مقدمه).

ب- خوێندنەوەی ناوەرۆك (فهرست)ەكەی.

ج- هەروەها هەندێ بابەت و شوێنی جیاجیای پەرتووكەكە.[1]

***پاشكۆ:***

خوێندكاری سەنگین:

زەرورە قوتابی زیاتر لە هەموو خەڵكی تر لە مەیدان و گۆڕەپانی كاردا ئەسپی خۆی تاوداو زانستەكەی بە شێوەیەكی عەمەلی و ئەرێنی وێنە بكا و نیشانی بدات، چونكە زانست و زانیاری گەر كاری پێ نەكرێ و نەخرێتە

---

١ - حلية طالب العلم. لا/ ٥٤-٥٥

قالبێکی عەمەلی خێری پێوە نیە و کەلکیشی نیە، چونکە کردەوە (العمل) بەرهەمێکە لە بەرهەمەدیار و بەرچاوەکانی زانیاری..

بۆیە پێویستە خوێنکاری زانستە شەرعیەکان کەسایەتیێکی جیای هەبێ لەگەڵ خەڵکی تر لە دوورو نزیکەوە لە شێوەی خاڵ (الشامة)ی سەر ڕوو بەرچاو بکەوێ و هەستی پێ بکرێ، جا جیاوازی کەسایەتی‌یەکەی دەخوازێ ئەم بوارانە بگرێتەخۆ و لەخۆ بگرێ..

**یەك: بیرو باوەڕ (العقیدة):**

هەڵبەتە بوارو لایەنی عەقیدە و بیرو باوەڕ گرینگترینی ئەو لایەنانەیە کە مافی خۆیەتی زیاد لە هەر بوارێکی تر قوتابی ئەهەمیەتی پێ بدات و بە شێوەیەکی دروست و لە سەرچاوەیەکی ساغ و ساف بەدەستی بهێنێ و بەرجەستەی بکات لە هزرو بیریا، چونکە مرۆڤی موسڵمان یان موسڵمانێکی ڕاست و ڕاستگۆیە یانە ناڕاست و سەختەکارە، جا هەندی موسڵمانی ڕاستگۆ بە عەقیدە و بیروباوەڕی لە سەرچاوەی بێگەردی قورئان وسوننەت وەردەگرێ و هەڵدەهێنجێ، بێجگە لەمە هیچی‌تر بەسەرچاوەی عەقیدەی خۆی نازانێ و هەروەها تەواو تەواو پابەندە بە بڕگەو بابەتەکانی عەقیدە و سەرتاپای ژیان و گوزەرانی لە ژێر سایە و سێبەر و کۆنترۆڵی عەقیدەیە..

**دوو: بواری خواپەرستی (العبادة) و بەندایەتی خوا:**

ئەم بوارەشیان لە دوو لایەنەوە تێبینی دەکرێ..

١- لایەنی زانستی شێوەیی.

٢-لایەنی کرداری پراکتیزەیی (التطبیقي).

بابای زانستخواز (طالب العلم) پێویسە زانیاریەکی تەواو و تۆکمەی هەبێ دەربارەی بواری خواپەرستی و بەندایەتی، بە شێوەیەکی وا تێکڕای ئەو

خواپەرستیانەی، کە ڕۆژانە مومارەسەو جێ بەجێیان دەکات گشت پایە ( الرکن) و فەرزو سوننەت و ئادابەکانیان چاك چاك بزانێ و بناسێ و لێکیان بکاتەوەو چەندیەتی و چۆنیەتی‌یان دەرك بکات..

فێرخوازی ئازیز:

بێگومان ئامانج و مەبەست لە بەدەستهێنانی زانستە شەرعیەکان بریتی‌یە لە بەندایەتی کردن بۆ خوا و لێ نزیك بوونەوەی، جا پێویستە هەڵگرانی ناسنامەی قوتابیەتی –زانستە شەرعیەکان بە خواپەرستی و بەندایەتی چاك و ساغ بێخلّتەکردنیان بۆ خوا بناسرێن و لە خەڵکی تریش جیا بکرێنەوە، هەروەها سەرەڕای ئەنجامدان و بەجێ هێنانی‌خوا پەرستی‌یە واجبەکان مافی خۆیەتی سوننەتەکانی رەواتب و غەیرە رەواتب سیواك و تەواوی ئەو سوننەت و زیکر ویردانەی، کە لە سەرچاوە متمانە پێکراو (موثوقة)کان ئاماژەیان پێ کراوە گرنگیان پێ بدرێ و لە خۆدا بەدی بهێندرێن.

## سێ: بواری خووڕەوشت (الاخلاق):

بواری خووڕەوشت (ألاخلاق)یش یەکێکی ترە لەم بوارانەی، کە زەرووڕەو خوێندکاری ناوەندەکانی –زانستە شەرعیەکان بیکات بە گۆڕەپانی کاری و ئەسپی خۆی تیا تاودا وپشکی شێری تیا بەدەست بهێنێ، بە شێوەیەك بەر لەوەی بە زمانی زانیاری و گوفتار خەڵکی و دەورو بەر بانگەواز بکات و بدوێنێ، خووڕەوشتی بەرزی بکا بە هۆ و ئامرازی بانگەوازی، چونکە خووڕەوشتی بەرز کاریگەری زیاترە لەسەر خەڵکی و دەروونیان لە زانیاری و گوفتار بۆ دەرخستنی ڕووی حەقیقەت و ڕاستیەتی، ئەمەش گەر سەرنجێکی زێڕینی مێژووی ئیسلامی بدەین دەبینین زۆربەی هەرەزۆری گەلانی جیهان

هۆی موسڵمان بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ڕاستەوخۆی خـوو ڕەوشـت و ئەخلاقی ڕەسەنی موسڵمانان ، چونکە موسڵمانان کـاتێك کـە دەچـوون بـۆ فەتح و ڕزگاری وڵاتانی جیهان هەرچی ڕەوشت خوو ئەخلاقی بەرزو ڕەسـەنی ئیسلامی بوو تیایاندا هەبوو بـەردیدی گـەلانی دونیـا دەکـەوت، بۆیـە دەسـت بەجێ باوەڕیان دەهێناو دەست لە ملانـی ئیسـلام دەبـوون بـەر لـەوەی هیـچ شتێك لە پرانسیپ و مەبادیئە مرۆڤ دۆستەکانی بزانـن و شـارەزابن، چونکـە بنەماکانی وەك سیمایەکی گەش لە یەکە یەکەی تاکەکانی دەدرەوشانەوە..

جا کەوابێ فێرخوازی ڕەوشت بەرز:

تۆش هەوڵدە بۆ بەدەست هێنان و بەرجەستەکردنی تێکڕای ئـەو ڕەوشـت و خوانـەی کـە زەروور و گرینگـن بـۆ کەسـایەتی خـۆت وەکـو: هێمنـی و بــە ویقـاری و پیـاوەتی (المـروۆة) و شـەهامەت و دەســـت دەم و داوێـن پـاکی و خۆبەکەم گری و نەرم و نیانی و بە ئارامی و ڕاستگۆیی و بوێری و تاد.

دوور بە لە هەر چی خووڕەوشتێکی سووك و بەد و نەگونجاوە، کەوا چ بـە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێ یان ناڕاستەوخۆ کـار لـە کەسـایەتیت دەکـەن، جا وریابە هەرزەکارانە ڕەفتار نەکەی و بـیر نەکەیتـەوە، نـەبادا بـە هـۆی چـوون بەپیر داخوازیـەکانی دەروون دووچاری لەکـەدار بوونـی کەسـایەتیت ببــی و گرفتی دابەزین و بێ متمانەیی رووت تێ بکات..

وەك چۆن پێشینانمان کە لە لوتکەی خووڕەوشتی بەرزدا بوون، تەنانـەت هەرگیز ڕازی نەبوون بە کۆڕ و مەجلیسێك، کـە قسـەی سـووك و پـووچ و بـێ مەنا (اللغو)ی تێدا هەبێ و پەردەی ئەدەب و حـەیا و حەشمـەتی تێـدا هـەتك بکرێ بۆ وێنە: (الاحنف بن قیس) گوتوویەتی: (جنبوا مجالسـنا ذکـر النسـاء والطعـام، فـأنی أبغـض الرجـل یکون وصافـا لفرجـه وبطنــه) واتــە: کـۆڕو

مەجلیسەکانمان دوور بگرن و بپارێزن لە باس و خواسی ئافرەتـان و خـواردن و خۆراك، من زۆر ڕقم لەو کەسەیە کە باسی داوێن و زگی دەکات.

چونکە تەواو پابەند بوون بە دەقە شەرعیەکان (النصوص الشـرعیة) وەك خوای کار لەجێ لە بارەی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ ئەم تەرزە کۆڕو مەجلیسانە، دەفەرمووێ: ﴿ إذا سمعوا اللغو أعرضوا عنه, قالوا لنـــا أعمالنـــا ولكم أعمالكم سلام عليكم لا نبتغي الجاهلين﴾[1].

**چوار: لایەنی شێوەو دیمەن ڕواڵەت:**

هـەروەها ئیسـلام گرنگـی و بایـەخی زۆری بـــە بـواری دیمـــەن و ڕواڵـــەت (المظهر)یش داوە، تا ئەو دەرەجەی لە هەر تاکێکی موسـڵمان دەخـوازێ کـە پێچەوانە و جیاوازی لەگەڵ (أهل الكتاب) لە هەر دیمەنێکدا بەکار بهێنێ.

بۆیە زانستخوازان ئەم بوارەشیان پشتگوێ نەخستووە و بەلاوەیان نەناوە بە شـێوەیەك هـی وایـان هـەبووە بـەبێ خـۆ بـۆن خۆشـکردن (التطیـب) بـۆ دەرسەکەی نەچووە بۆیە: لەم بارەیەوە گوتراوە: (الحلية في الظـاهر تـدل على ميل في الباطل).

ئینجا هەندێ لەم دیمەنانەو ڕواڵەتانـەی، کـە ئیسـلام پـێی لەسـەر پێـوە پابەندبوونیان داگرتووە جەختی لەسەر کردووە، بریتین لەمانەی خوارەوە:

١- ڕیشداری و هێشتنەوەی ڕیش (أعفاء اللحية).

٢- پاك و خاوێنی سەر و سیماو دیمەن و ڕواڵەت.

٣- خۆ نەچواندن بە خاوەن نامەکان (أهل الكتاب) لە شکل و شێوەو جل و بەرگ.

٤- خۆ نەچواندن بە ئافرەتان.

---

١ - القصص/ ٥٥

٥- پۆشینی بەرگ و پۆشاکی شەرعی[1].

کەواتە: قوتابیانی خۆشەویست:

ئێمەمانان چاوەڕوانی هەنگاوە بە فەڕەکانتانین، ئازیزان! هەنگاو بنێن ئیسلام و موسڵمانان بە ئێوە سەربەرز و شکۆمەند دەبن، جا ئومێدەوارین ئاوات و ئومێدەکانمان لە بار نەبەن و نەیان خەنە گۆڕو بێ هیوامان نەکەن، هەوڵدەن هیچ تاوێك ماندووبوون و خەم ساردیتان پێوە دیار نەبێ و بوێر و ماندونەناسانە هەنگاو بنێن، هەم بۆ بەدەستهێنانی زانیاری بەسود، هەمیش بۆ بەکرداری کردنی و خزمەت پێکردنی ئەم زانیاریە، سەیرکەن چۆن پێشینانمان باس و خواسی سەیرو سەرسوڕهێنەریان لێ دەگێڕدرێتەوە، بە وێنە: وەك دەڵێن هی وایان هەبووە لەڕێگای گەڕان بەدوای زانست ئاوی لێ بڕاوە ناچاری میز خواردنەوە هاتووە، یانە یەکێکیان دووری و سەختی ڕێگا ئەوەندە کاری تێکردووە و ئەزیەتی داوە تا وەکو میزی بۆ خوێن گۆڕاوە!!

لە مەیدانی کارو خزمەت بە پرۆسەی زانست و زانستخوازیشدا سەدەها بەڵگە و نموونەی هەمە چەشن هەن و لەبەر دەستدان، کە لەم دەرفەتەوە ناتوانین زۆر لەم بارەیەوە بدوێین و باسەکە قوڵتر بکەینەوە، تەنها بۆ نموونە:

أ- پێشەوا: (النووی) کە بە تەنیا (٤٥) ساڵ تەمەنی بووە سەرەڕای ئەوەی ڕۆژانە دوانزە (١٢) دەرسی گوتوونەتەوە، کەچی خاوەنی (المجموع): (شرح المهذب) و (شرح صحیح مسلم)ە، کە هەر یەکیان (١٠-١٥) بەرگن. هەروەها خاوەنی پەرتوکگەلێکی گەورەو گچکەیە وەکو: (تهذیب الأسماء

---

١ - توجیهات ضروریة لطالب العلم / ص-٥٦

واللغات) و (روضة الطالبين) و (رياض الصالحين) و (الأربعين) و (التبيان في آداب حملة القرآن) و...تاد.

ب- ئەدی یەکێکی وەکو: (ابو وفاو ابن عقيل الحنبلی) که کتێبی (الفنون) کەهەشت سەد (٨٠٠) بەرگە، نووسیوە، کتابێکی بچووکیشی بە قەبارەی (٢٠) بەرگی نووسیوە.

کەواتە ڕێك وەك زانایان گوتوویانە: (العلم لا يُعطيك بعضه حتى تعطيهُ كلك) یان وەك ئیمامی علی خوای لیّ ڕازیبێ فەرموویەتی: (يهتف العلم بالعمل فإن أجابه ولا أرتحل).

## بەشی چوارەم

# چاودێری کردن و ڕاگرتنی ڕێزو حورمەتی مامۆستا لەگەڵ چەند ڕێنمایەکی پێویست

بێگومان زانست و زانیاری لە سەرەتاوە بە تەنها لە سەرچاوەو پەرتووك وەرناگیرێ، بەڵکو پێویستە لەلایەن مامۆستایەکەوە بخوێندرێ و شێوە و چۆنیەتی خوێندن و فێربوون، هەروەها بڕینی قۆناغەکانی خوێندن بەپێی ڕێنماییەکانی مامۆستا و لەژێر چاودێری و بە ئاگاداری ئەوەوە بێت..

بۆ ئەوەی نەبادا فێرخواز دووچاری خلیسکان و ترازان بێت کورد گوتەنی: (شەلم کوێرم ئاپارێزم) نەکەوێتە نێو دونیای سەرچاوەو پەرتووکە زانستیەکانەوە بە هۆی نەزانین و ناشارەزایەوە نەیانشێوێنێ. شاعیریش لەم بارەیەوە گوتوویەتی:

ألا لا تنال العلم إلا بستة: سأنبئك عن مجموعها ببيان:
ذكاءٌ وحرصٌ و إصطبارٌ و بلغةٌ وإرشاد أستاذٍ وطول زمانٍ[1]

فێرخوازی ڕێزدار:

مادام مامۆستا ئەوەندە ئەهمیەت و کاریگەری ڕاستەوخۆی لە سەر ژیان و فێربوونی قوتابی هەبێ و بێ ئەو قوتابی چی بۆ نەکرێ و کاری لەسەربوونی ئەو بوەستێ، زەرورە خوێندکاری زانستە شەرعیەکان- هەرچی ڕەوشت و ئەدەب و ڕێزو حورمەتێکە لە بەرامبەر مامۆستاکەیدا ڕەچاوی بکات و بەچاوی ڕێزەوە سەیری بکات، چونکە ئەم جۆرە خەسڵەت و هەڵس و کەوتە

١ - الجامع في طلب العلم الشريف/ ص-١٨١

به هێمای سەرکەوتن و فێربوون و ڕەوشت بەرزی خوێندکاریش دەژمێردرێ، کەواتە دەبا مامۆستاکەت جێگای ڕێز و تەقدیر و بەرز ڕاگرتن بێ لەهەر شوێن و کاتێکدا بێت بەپێی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە:

١- بە ئەدەبەوە لەگەڵیدا دانیشەو چاودێری ڕەوشتەکانی دانیشتن بکە.

٢- بەوپەڕی ڕێزو ئەدەبەوە قسەی لەگەڵ بکەو ڕەفتارو گوفتار جوان بە.

٣- بە شێوەیەکی ڕێك و گونجاو پرسیاری لێ بکە و وریا بە پرسیارەکە بەجێ و لەجێ بێت.

٤- لەکاتی قسەکردنیدا جوان گوێ بگرە و سەیری ئەم لاو ئەو لا مەکە.

٥- لەکاتی دەرس خوێندن دا بەڕێزەوە کیتابی لەبەردەم بکەوە.

٦- لەهەردوو حاڵەتی قسەکردن و ڕۆیشتنیدا پێشی مەکەوەو قسەیشی مەبڕەو لەبەر دەمیدا زۆر مەڵێ و زۆر بڵێ مەبە.

٧- لەکاتی پرسیارلێکردن، بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانت زۆری لێمەکە.

٨- زۆر پرسیاری لێ مەکە، بەتایبەت لەو کاتانەی مامۆستایانی تر و هاوڕێیانی ئامادەن، چونکە ئەمە بۆتۆ غرووریەو ئەزیەتدانی مامۆستاشی تێدایە.

٩- بەناوی تایبەتی خۆی بانگی مەکە و ناوی مەهێنە، بەڵکو بە وشەی: (مامۆستاگیان، یان مامۆستای بەڕێز یاخود مامۆستا) بانگی بکە و بیدوێنە، هەروەها لەدوورەوە ئەگەر وا پێویست بێ ئەگینا بانگی مەکە.

١٠- لە ئان و ساتی دەرس خوێندن دا، هەوڵدە کەیف و تامەزرۆیی و بە تەنگەوەبوونی دەرسەکەت نیشان بدە، بەشێوەیەك ماناى کەڵك لێ وەرگرتنی لێ بفامرێتەوە.

١١- ئەگەر هەڵەیەکت لە لایەن مامۆستاوە هەست پێکردو بەر دید

کەوت، با لە دەم و چاوتدا ڕەنگ نەداتەوە و لای خەڵك باسی مەکە، چونکە کەسی بێ هەڵە تەنها خوایە، کەس لە هەڵە بێبەش نیە.[1]

١٢- خۆت بپارێزە لە هەر کارێك، کە دەبێتە هۆی تووڕەکردنی مامۆستاکەت، بەتایبەت بە مومارەسەکردنی تاقیکردنەوەی لەسەر ئاست و توانا و بەهرەی زانستیی، چونکە فاکتەرێکی بەهێزە بۆ هەست و نەست بریندارکردنی، کە هەندێ لە زانایان بە (حرب الأعصاب)ی ناو دەبەن.

١٣- هەر کاتێك نیازی گۆڕینی مامۆستا و ڕۆیشتن لە خوێندنگا(مدرسة)ت لا گەڵاڵەبوو، بۆ ڕۆیشتن مۆڵەتی لێ بخوازە، چونکە هەم بۆ ڕێز و حورمەت گرتنی مامۆستا چاکترە، هەمیش هۆ کارێکە بۆ بەردەوام بوونی سۆزو خۆشەویستی مامۆستا و لەدەست نەدانی ئەم خۆشەویستی و پەیوەندییەی کە لە نێوانتاندا هەبووە.

١٤- هەروەها پێویست وایە کاتێك قوتابی دەچێتە خزمەت مامۆستا بەو پەڕی ڕێك و پێکی و خۆ ئامادەکردنەوە بچێت .. واتە پاك و خاوێن بێ لە بەرگ و پۆشاکی، دڵی لە هەرچی کارێکی سەرقاڵ کارە خاڵی و بەتاڵ بێت، هەروەك چۆن مامۆستا ئەگەر لە شوێنێکی وابوو، کە مۆڵەت وەرگرتنی گەرەك بوو، بەبەبێ مۆڵەت وەرگرتن وەژوور نەکەوێ، هەر کە چووە ژوورەوەش سڵاو لە ئامادەبوان بکات بە گشتی و بە تایبەت مامۆستا و چاك و چۆنیشی بکات و لە هەواڵیشی بپرسێ، بەسەر خەڵکەوە پاز نەدات و لە کۆتایی مەجلیسەکە دابنیشێ، مەگەر مامۆستا داوای لێ بکات بچێتە سەرەوە، یاخود ئامادەبوان و دانیشتوان ڕیزی بگرن و جەخت لەسەر چوونە سەرەوەی بکەن، هەروەها هیچ کەس لە شوێنی خۆی هەڵ نەستێنێ، تاکو

---

١ - وەك شاعیریش دەڵێ: (من الذي ما ساء قط ومن له الحسنى فقط )

له شوێنیا دابنیشێ، له ناوەڕاستی مەجلیس و له نێوان دوو برادەر و هاوەڵان بەبێ ئیزن دا نەنیشێ، مەگەر بە ئارەزووی خۆیان شوێنیان بۆ کرددەوە ئەو کات قەیناکات، بەڵام بە ڕێکی دانیشێ و شوێنیان لێ تەنگ و ناخۆش ناکات و ڕەچاوی هەست و شعوری ئامادەبوان دەکات، لەکاتی قسەکردنیدا دەنگی بەبێ پێویست بەرزو بڵند ناکات و پێ ناکەنێ و یاری بە دەستەکانیەوە ناکات.

١٥- پێشەوا: (علی کوڕی ئەبی تالیب)یش خوای لێ ڕازی بێ لەم چەند ڕستانەی خوارەوە ئاماژە بە کۆمەڵە مافێکی مامۆستا و فێرکار بەسەر قوتابیەوە دەکات، کە دەفەرمووێ: ((من حق المعلم علیك أن تسلم علی الناس عامة وتخصه بتحیه، وأن تجلس أمامه، ولا تشیرن عنده بیدیك، ولاتغمزن بعینیك ولاتقولن قال فلان خلاف ماتقول، ولاتغتابن عنده أحدا، ولا تشاور جلیسك في مجلسه، ولا تأخذ بثوبه إذا قام، ولا تلح علیه إذا كسِلَ، ولاتعرض-أی لاتشبع- من طول صحبته)). کە بریتین لەمانە:

مافێکی فێرکار (المعلم) بەسەر خوێندکار ئەوەیە کە سەلام کردنی لەخەڵکی بەشێوەی گشتی بێ، بەڵام هی مامۆستا تایبەت بێت وزیاتر ڕێز و حورمەتی تێدا ڕەچاو بکات، هەروەها پێویستە فێرخواز فەقێ بەو پەڕی ڕێزەوە لە بەرامبەریدا دابنیشێ وگەمە بە دەست و چاویەوە نەکات، هەروەها نابێ بڵێت فلانە مامۆستا دەربارەی ئەم مەسەلەیە پێچەوانەی تۆ دەڵێ، لەلای مامۆستا نابێ غەیبەت و بەخراپ باسی هیچ کەس بکات و گفت وگۆ و قسە و پستەپست لەگەڵ هاوەڵ و هاوڕێکانی لە مەجلیسی مامۆستادا ناکات، هەروەها لەکاتی هەستانی دەست بە جلەکانیەوە ناگرێت و لەکاتی بێتاقەتی و ماندوویی‌دا زۆری و ئیلحاحی لێ ناکات و هەرگیز لە مەجلیس و هاوڕێیاتی تێر نابێ و وەڕسی و بێتاقەتی دەر نابڕێ).

**هەڵس و کەوتی پێشینا نمان لە ئاقار ماموستایان دا:**

پێشـینانمان ئـەم ڕاسـتی‌یەیان چـاك دەرك کردبـوو، کـە پاراسـتن و پابەندبوون بـە خەسـڵەتی بـەرز ڕاگرتنـی مامۆسـتاو ڕێـز و حورمـەت نوانـدن بەرامبەری فاکتەرێکی تابڵێی کاریگەرە لەژیانی فێرخواز و مایەی زیاتر کەڵك لێ وەرگرتنە، بۆیە دەبینین ئەمیەتی زۆریان بەم خەسڵەتە داوە، بۆ نموونە:

أ- هەندێکیان نەریتیان وا بووە بەر لەوەی بچن بۆ خزمەت ماموستاکەیان سەرەتا خێر (صدقة) ێکیان دەکرد ئینجا دەچوون بۆ خزمەتی..

ب- هەروەها بەم شێوەیەش لەخوا دەپاڕانەوە: (اللهم أستر عيـب معلمـي عني، ولا تزهب بركه علمه مني).

ج. (ڕەبیع) کە قوتابی و هاوەڵێکی پێشەوا شافیعی بوو ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت دەفەرمووێ: ((ما إجـترأت أن أشرب المـاء والشـافعي ينظر إلي، هيبة له)) واتە: قەت جورئەتم نەکردووە، لەبەردەم شـافیعی دا ئـاو بخۆمەوە لەبەر ڕێزو هەیبەتێك بۆی.

د- پێشـەوا شـافیعی- ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت- دەفـەرمووێ: ( كنـت اصفح الورقة بين يدي مالك صفحاً رقيقاً هيبة له لئـلا يسـمع وقعـها ) واتـە: لاپەڕەی کتێبەکەم لـە خزمـەت ئیمـام- مـالك زۆر بـە هێواشـی و نـەرمی و لەسەر خۆیەوە هەڵدەدایەوە نەبادا گوێی لێی بێت.

**چەند ڕێنمایەکی پێویست:**

**یەکەم: هەڵبژاردن و دەست نیشان کردنی کەسێکی شیاو بۆ خۆی بە سیفەتی مامۆستایەتی:**

بـەڵێ بـە ڕاسـتی کـارێکی تابڵـێی پێویسـتە کـە قوتـابی زانسـتە شەرعیەکان- کەسێکی وا هەڵبژێرێ و بیکات بە مامۆستاو چاو ساغی خۆی و

زانیاری لێوه فێر بێت، كه زاناو به تواناو له خوا ترس و پارێزگـار ( متقـي) و پەرێز پاك بێت، چونكه وەك موحەممەدی ئیبن سیرین و مالكی كوڕی ئەنەس و زۆرێكیش له پێشینان ( السلف) فەرموویانە: (( إن هذا العلم دیـن، فـانظروا عمن تأخذوا دینكم)) واته: به ڕاستی ئەم زانسته ئایینه، كەواته سەرنج بدەن و بزانن ئایینەكەتان له چ كەسێكەوه وەردەگرن.

**دووەم: فـێرخواز نابـێ خۆبەگـەورەگر بـێ لـه هەمبـەر وەرگرتنـی زانستدا:**

بەڵێ بێگومان پێویسته- فێرخواز، فەقێ ئەو پەڕی مل كەچی و نەرمی و بێفیزی بنوێنێ بۆ فێركار (معلم)ەكەی و جڵەوی كاری تەواو بداته دەست، هەروا مل كەچ و گوێ ڕایەڵ و نەرم و نیـان بێـت لـه بەرامبـەریدا بـه شـێوەی نەخۆشـێكی نـەزان و كۆڵـەوار بـۆ دكتۆرێكـی وشـیار و ژیـر و میـهرەبان، بـا هەرچەنده فێركار و مامۆستاكەشی به تەمەن لـەوی بچووكـتر بێـت و خـۆی و بنەماڵەكەیشی بەقەد وی ناوبانگ و شۆرەتیان نەبێت، چونكه بێگومان مرۆڤ به نواندنی مل كەچی و ئارامگرتن لەسەر بینینی زەلیلی بـۆ دەسـت خسـتنی زانیاری، دەگات به زانست و پلەی زانایی، لەم بارەشەوه گوتراوه:

ومن لم یذق طعم المذلةِ ساعةً        قطع الزمان بأسره مذلولاً

هەروەها ئیبن و عەباسیش خـوا لێـان ڕازی بێـت فەرموویـەتی: (ذللـت طالباً فعززت مطلوباً).

**سێیەم: مامۆستاكەت چاكترین و لـەبارترین پێشـەنگ (قدوه)یەكـه بۆتۆ:**

بەڵێ خوێندكاری دڵسۆز: باشترین و چاكترین و له بارترین كەسێك كـه تـۆ بیكەی به پێشەواو پێشەنگ بـۆ خـۆت، تـاكو لێی بەهرەمـەند بـی و سـوود و كەڵكی لێوه ببینی بێجگه لەفێربوون و زانیـاری لێوەرگرتـن خەسـڵەت و

خورەوشـتـە بـەرز و رەسـەنەکانی و بـەهرەو تواناکـانی لێیـەوە فـێربیت مامۆستاکەتە، کە بە باوکی ئایینی (الأبوة الدينية) یاخود وەك لـە قـانونی ئێرلـەندی بە ( الرضاع الأدبي) هـاتووەو ناوزەد کراو[1]، بـەلام وریـا بـە خۆشەویستی مامۆستاکەت وات لیٚ نەکات لە چوارچێـوەی یاسـایی خـۆی دەربچێت و دووچاری کاری سلبی ناشیاو ببیت، بە بیانووی شوێن پێهەلگرتن و شوێن کـەوتنی کە لەخۆتـەوە دیار نییەو هەستی پـێ ناکـەیت، بـەلام خەلکی تر هەستی پیٚ دەکەن و تەواو لیٚی ئاگادارن– کەواتە هەولْ مـەدە لـە دەنگ و نەغمەو ئاوازو شێوەی هەستان و دانیشتن و هەلس و کەوتی رۆژانەی تاد چاوی لیٚ بکەیت و تەقلیدی بکەیتەوە، چونکە ئەمانە بەشێکی گرنگن لە پێکهاتەی کەسـایەتی مامۆستا بەمانـە لـە خـەلکی تـر جیـا دەکرێتـەوە و تایبـەتن بـە کەسایەتی خۆی، حـەق وا نیـە تـۆ لەمانـە چـاوی لیٚ بکـەیت و کەسایەتی خۆشت بشێوێنی.

## چـوارەم: بـە دەسـت هێنـانی بـە تەنگـەوە بـوون و بـە مشـووری مامۆستا لە دەرسەکاندا:

هەلبەتە قوتابی چەندە بە رێکـی گـوێ بگـرێ بـۆ دەرس و هـزر و بـیری و هەست و نەستی چـەندە لـە گـەلْ مامۆسـتادا بێـت، هێنـدەش بگـرە لەمـەش زیاتر مامۆستا گرنگی پێدان و بە پەرۆشەوە بوونـی لـە دەرس ووتنەوەکـەیدا هەست پیٚ دەکریٚ..

بۆیە پێویسـتە قوتـابی فـەقیٚ– نەبێتـە ئـامرازێکی سـەلبی بـۆ زانیـاری مامۆستاکەی، بە نواندنی شێوەی تەمبەلی و سستی و کەمتەرخـەمی و گـویٚ نەدانە دەرس و وانە زانستیەکانی، چونکـە ئـەم تـەرزە خەسـلەت و هـەلس و کەوتانە سروشت و میزاجی مامۆستا تێك دەدەن و دەشێوێنن .

---

١ - ئەوەی راستی بیت باوکی ئاییی یان باوکی راستی گونجاوترە.

لەم بارەیەوە خەتیبی بەغدادی دەفەرمووێ: ((حق الفائدة أن لاتساق إلا الى مبتغيها، ولا تعرض إلا الراغب فيها، فإذا رأى المحدث بعض الفتور من المستمع فليسكت، فإن بعض الأدباء قال: نشاط القائل على قدر فهم المستمع))[1] واتە: حەق وایە شتی بە شوود(الفائدة) بۆ کەسێکی ئارەزووی نەبێت نەگوترێ و باس نەکرێ، هەرکاتێك قسەبێژ هەستی بە سستیو کەمتەرخەمی گوێگر کرد پێویستە بێدەنگی لێوە بکات و واز بێنێ، هەروەها هەندێ لە ئەدیب و رووناکبیران گووتویانە: گرنگی پێدانی قسەبێژ بە گوێرەی تێگەیشتنی گوێگرە.

**پێنجەم: تۆمارکردن و نووسینەوەی هەندێ بابەت و شتی پێویست لە کاتی دەرس خوێندن دا.**

خوێندکاری بە مشوور: نووسینەوەی هەندێ شتی زەروورو گرنگ لە کاتی دەرس خوێندن دا کارێکی تابلێی بەرهەمدار و بەسوودە بۆ لە یاد نەکردن و پارێزگاری لێکردنیان، جا بزانە ئەم کارە لە خزمەت مامۆستایەکەوە بۆ مامۆستایەکی تر جیاوازەو فەرق دەکات، بۆیە ئەنجامدانی ئەم کارە ئەدەب و مەرجێکی گەرەکە: -

أ- رەوشتەکە: بریتییە لە ئاگادارکرنەوەی مامۆستاکەت، لە ئەنجامدانی ئەم کارە، کە بە راشکاوی پێی بڵێی تۆ هەڵدەستی بە نووسینەوەی ئەم شتانە بۆ لە یاد نەکردن و لەیادنەچوون.

ب- مەرجەکەش : بریتییە لەمە، کە ئاماژە بەو راستییە بدەی کە تۆ ئەم شتانەت نووسیوەتەوە کە لە دەرسەکانتا گوێ بیست بوویت لە مامۆستا.

---

[1] - حلية طالب العلم/ ص-٢٧

## بەشی پێنجەم

# چۆنیەتی هەڵس و کەوتی قوتابی زانستیەشەرعیەکان لە نێو قوتابخانەدا

قوتابخانە کەوا ماڵی دووەمی قوتابییە، کۆمەڵە ڕەوشت و یاساو ڕێسایەکی تایبەتی هەیە و لەخۆ گرتووە، زەرووڕەو ڕەوشەکە وا دەخوازێ کەوا ئەو ڕەوشت و یاسا و ڕێسایانە چاودێریان بکرێت و پشتگوێ نەخرێن و لە لایەن قوتابییەوە بەهەند هەڵ بگیرێن..

ئینجا دەتوانیت شێوە و چۆنیەتی هەستان و دانیشتنی قوتابی لە نێو مەدرەسەدا، لە چەند خاڵێکدا بە کورتی ڕوون بکەینەوە و بیخەینە ڕوو:

### یەك: گوێڕایەڵی براگەورە (الأمیر):

لە ئیسلام دا دەستنیشان کردن و هەبوونی برا گەورە (الأمیر) مەرجی بنەڕەتی هەر کارێکە، جا چ جای لە ناوەندێکی زانستیدا، کە دەتوانین بە کارگەی بەرهەمهێنانی ڕابەر و چاوساغ و پێشەوا و برا گەورەکانی گەل و کۆمەڵی دابنێین و ناوزەدی بکەین..

بێگومان گوێڕایەڵی و فەرمانبەری (السمع والطاعة)ی براگەورەش لە دید و بۆچوونی ئیسلامیدا پێویستە و فەرزە.. بۆیە قوتابی زانستە شەرعیەکان بڕوا و قەناعەتی وایە و بە ئەرکی سەرشانی و فەرزیشی دەزانێ، کە گوێڕایەلی براگەورەکەی بکات و قسەی نەشکێنێ و لە فەرمان و بڕیارەکانی دەرنەچێت، قەناعەتیشی وایە، بێ فەرمانی کردن و قسە شکاندنی تاوانێکە و ئەنجامی داوە، بەمەش خۆی مستەحەقی تووڕەیی خوا کردووە، چونکە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرموێ: ((من أطاعني فقد أطاع الله, ومن عصلني

فقد عصي الله, ومن يطع الأمير فقد أطاعني, ومن عصى الأمير فقد عصى))[1]
واتە: هەر کەسێك فەرمانبەریم بکات ئەوا فەرمانبەری خوای کردووە، هەرکەس سەرپێچی و بێ فەرمانیم بکات، بێگومان سەرپێچی خوای کردووە، هەرکەسێك فەرمانبەری براگەورە بکات و فەرمانی نەشکێنێ، ئەوە فەرمانبەری منی کردووە، هەرکەس سەرپێچی براگەورە بکات سەرپێچی منی کردووە.

ئینجا ڕاستییەکیش ماوە ئاماژەی پێ بدەین، کە گوێڕایەڵی وجێبەجێ کردنی فەرمانی براگەورە لە هەردوو حاڵەتی خۆشی و ناخۆشییەوە پێویستە و گەرەکە، بەڵام دەبێ وریا بیت کە ئەو فەرمانبەریەش بەندە بە سنووری شەرعی خۆی و چوارچێوەی تایبەتی خۆی هەیە و ڕەها(مطلق) نیە، کەواتە هەرکات فەرمان و بڕیارێك لەهەر ئاستێکەوە بێت نەك بەتەنها لە لایەن براگەورەوە لە سنوور و چوارچێوەی شەرعی خۆی لایدا و ترازا، ئەوا ئەو کاتە نەك هەر فەرمانبەری و بە گوێ کردن دروست نیە، بەڵکو خۆی لە خۆیدا ئەنجامدانی تاوانێکی زلیشە، وەك سەروەرمان ﷺ دەفەرموێت: ((لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق))[2] لە کۆتایی ئەم خاڵەدا دەڵێم:

حەقی خۆیەتی ئەگەر هەر مەدرەسەیەکیش ، تائێستا حسابی بۆ دەست نیشانکردن و دانانی براگەورە (الأمير)ی حوجرە کەی نەکردبێ و بەهەندی هەڵنەگرتبێ، پێویستە لەمەو دوا ئەم مەسەلەیە چی تر فەرامۆش نەکرێ یا خەمی لێ بوخرێ.

هەروەها لەکاتی هەڵبژاردن و دانانی براگەورە، پێویستە ڕەچاوی ئاستەکانی زانستی و ژیری و ڕەوشتی و پارێزگاری و پابەندی و تەمەن و

---

١ - متفق عليه البخاري: ٧١٣٧, مسلم: ١٨٣٥

٢ - متفق عليه.

متدی هەڵبژێردراو و دەست نیشان کراو بکرێت.

پێویستە بابای هەڵبژێردراو(براگەورە) ڕەچاوی ئەرکەکانی بـرا گەورایـەتی بکات و بەچاوی ڕێز وسۆ زو ئینسافەوە، سەیری هاوەڵ و ئـەندامانی خـێزانی مەدرەسەکەی بکات و غروری و لووت بەرزی و خۆپەسەندی نەیگرێ.

## دوو: ڕەچاوکردنی گەورە و بچووکیی:

قوتـابی زانستەشـەرعیەکان هەرچـەندە، ئـەو حەقیقەتـە چـاك دەرك دەکا و دەزانێ، کە مرۆڤەکان بە گشتی یەکسانن، هیچ کەس لە بەندایـەتی و ڕەگەزەوە ئیمتیازی بەسەر کەسێکی ترەوە نیە، بەڵکو هەموویان بە شێوەی دەنکەکانی شانەی سەر یەکسانن، وەك پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((النـــاس مستورن كأسنان المشط))[1]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بڕواو قەناعەتی وایە کە لە هەندێك لایەنەوە جۆرە بەرزی و نزمی و گەورە و بچوکی‌یـەك هەیـە لـە نێـوان مرۆڤەکان، بۆ نموونە:

١- لایەنی زانیاری:

هەڵبەتە مرۆڤەکان بە گشتی و تویـژی قوتـابیش بـە تایبـەتی، مـەرج نیـە ئاستی زانستیان یەکسان بێت و لە ئاستێك دابێـت، بـەڵکو جیـاوازی بـەرچاو هەستپێ دەکرێ، ئاست و قۆناغی زانستی کەسێك یانە قوتابیەك بۆ یـەکێکی تر جیاوازە،وەك پەروەدیگاریش دەفەرموێ: ﴿وفوق كل ذي علـــم عليـــم﴾[2] بۆیە قوتابی ڕەچاوی ئەم لایەنەوە دەکات، هەر کەسێك یا هەر فێرخواز و قوتابی‌یەك، کە ئاست و قۆناغی زانیاری لە خـۆی بـەرزتر و لەپێشـتر بێـت، ئەو پەڕی ڕێزو حورمەتی دەبێت لە بەرامبەریدا.

---

١ - أخرجه الديلمي

٢ - يوسف، ٧٦

### ٢- بارو لایەنی تەقوا و پاریزکاری:

بێگومـان جیـاوازی لە نێـوان بـەندەکان، لـە گۆڕەپـانی بەجێگـەیاندنی بەندایـەتی و پارێزگـاری و تـەقواداریش دا هەیـە وەك دەفـەرموویێت: ﴿ إن أكرمكم عند الله أتقاكم ﴾[1].

ئینجـا مـادام بـەڕێزترینمان لای خـوا پارێزکارترینمـان بێـت، پێویسـتە لـە لایەن قوتابیانیش هەر وا بێت و ڕێـز و ئـەدەب و حورمـەتێکی تایبـەتیش بـۆ کەسێکی لەم شێوەیە دابندرێ.

### ٣- باری ژیریی و هۆشمەندی:

قوتابی بەڕێز: باری ژیری و هۆشمەندیش یەکێکە لەو لایەنانەی کە مـرۆڤ ڕێزدارتر دەکات و زیاتر بەرزی دەکاتەوەو ڕێز و پلە و حورمەتیشی مسـۆگەر دەکات، ڕابەریشمان ﷺ دەفەرمووێ: (( ليليني منكم أولو الأحلام والنـــهى, ثم الذين يلونهم, ثم الذين يلونهـــم))[2] واتـە: بـا ئـەوان هۆشمـەند و ژیـر و عـەقل مەندن لە ئێوە بالێمـەوە نزیـك بـن، ئینجـا ئەوانـەی لـە دوای ئەوانـەوە دێـن، پاشان ئەوانەی کەوا لە دوای ئەوانەوە دێن.

### ٤- ڕەوشت و ئاکار بەرزی:

لە ئیسلامدا ڕەوشت و ئاکار بەرزیش هۆیەکە بۆ زیاتر ڕێزدار کردنی بابای ڕەوشت بەرز و بەرزو بڵندڕاگرتنی، وەکو پێغەمبەری ڕەوشت و ئاکار بەرزیش ﷺ دەفەرمووێ: ((إن من أحبكم الي وأقربكم مني مجلسا يوم القيامة,أحاســنكم أخلاقا))[3] واتـە: بەڕاستی خۆشەویسترین تان بەلای منەوە و نزیکترینتـان لـە

---

١ - الحجرات / ١٣

٢ - رواه مسلم: ٣٤٢

٣ - رواه الترمذي حديث صحيح: ٢٠١٨

من له پلـه و پایـه جێگـەدا لـه ڕۆژی دوایـی، ئەوانـەن، کـه ڕەوشـت جوانـترو بەرزترە.

٥- تەمەنداریی:

لایەنێکی تر لەو لایەنانەی، کە بەرزی و نزمـی و گـەورە و بچوکـی لـە نێـو ڕیزی مرۆڤەکان بە گشتی و چینی قوتابی بەتایبـەتی دەخولقێنـێ و دروسـت دەکات تەمەن زۆری و تەمەنداری یە، پێغەمبەری بەرز و بەڕێزیشمان ﷺ لـەم بارەیەوە دەفەرموێ: ((لیس منا من لم یرحم صغیرنا ویعرفْ شرفَ کَبیرِنـا))[1] واتـە: لـە ئێمـە نی‌یـە کەسێك بۆ بچوکمـان سـۆز نـەنوێنێ و بــەزەیی پێـدا نەیەتەوە، هەروەها ڕێزی گەورەمان نەگرێ، ئینجا چونکە قوتـابی زانسـتە شەرعیەکان پەروەردە و گۆشکراوی ئایینە پیرۆزەکەیەتی و لەسەر بنـەماو پرەنسیپەکانی ڕاهێنـدراوە، کە بەرنامەکـەی فـەرمانی پـێ دەکـات، هـەر کەسێك لە و لایـەن و ئیمتیازانـەی سـەرەوەی تێدا هـەبن، ڕێـز و ئـەدەب و حورمەتێکی تایبەتی و شایستە بـە کەسایەتی ئـەو بۆ دادەنـێ و پـتر ڕیـزی دەگرێ.

## سێ: بایەخدان بە پاك و خاوێنی:

خوڕەوشتێکی تر لەو خوڕەوشتەپەسەند و زەق و بەرچاوانـەی قوتـابی زانستە شەرعیەکان کەوا لە ژیانی فەقێیاتی و لە نێو قوتابخانە گرنگی پـێ دەدات بریتی‌یـە لـە - پـاك و خـاوێنی چونکـە بـە بەشـێك لـە ئـاین و بەرنامەکەی دەزانێ، پێغەمبەری ڕەوشت بەرزیش ﷺ دەفەرمووێ: ((الطـهور شطر الإیمان))[2]، واتە: پاك و خاوێنی نیوەی بڕوایە.

---

١ - رواه أبو داود بسند صحیح: ٤٩٤٣

٢ - رواه مسلم:٢٢٣

بێگومان پاك و خاوێنیش ئەو خەسڵەتە پەسەندەیە، كە پەیوەندیدارە بە زۆر لایەنەوە، جا پێویستە لە هەموو لایەنێكەوە گرینگی پێ بدرێ و ڕەچاو بكرێ بەتایبەت قوتابی، حەق وایە لە هەر لایەنێك لەو لایەنانەی خوارەوە ڕۆڵی بەرچاو بگێڕێ وجێ پەنجەی دیار بێت:-

### ١- لایەنی دڵ ودەروونی:

بەڵێ دەبێ لە سەرەتاوە ، قوتابی -زانستە شەرعیەكان- هەوڵدا هەرچی زووە دڵ و دەروونی پاك بكاتەوە تەواو تەواو گەسكی بدات و بژاری بكات لە هەرچی خەسڵەتی پیس و نەگریسی دەروونیی، وەكو گومانی خراپ(سوء الظن) و ئێرەیی(الحسد) و چروكی و ڕەزیلی(البخل) و خۆبە گەورەگرتن(الكبر) و خۆ پەسندی حەز لە خۆدەرخستن (حب الظهور) و...تاد وەك لەم بارەیەوە گوتراوە: ((يُطيبُ القلبُ للعلم، كما تطيب الأرضُ للزراعة))

واتە: دڵ پاك دەكرێتەوەو بژار دەكرێت بۆ زانیاری، هەر وەك چۆن زەوی پاك دەكرێتەوە بۆ كشتوكاڵ. چونكە زانیاری بەندایەتی و خواپەرستی دڵ و نوێژی نهێنیە و هۆیەكی گرنگیشە بۆ نزیك كردنەوەی دەروون لە خوای باڵا دەست، ئینجا هەروەك چۆن نوێژ ئەركی ئەندامە دیارو بەرچاوەكانی لاشەبە و بەوانەوە ڕا ئەپەڕێندرێ و جێ بەجێ دەكرێ، قبوڵ و دروست نابێت، مەگەر بە پاك كردنەوەی دەرەوە (الظاهر)ی ئەندامەكان و لاشە نەبێت لە هەر پیسی و بێ دەستنوێژیێ، بە هەمان شێوەش پەرستن (عبادة)ی دەروون و ئاوەدان كردنەوەی دڵ بە زانیاری ڕاست و دروست نابێت، مەگەر لەپاش پاك كردنەوەی دەروون و خاوێن و بژاركردنی نەبێت لە سیفەت و ڕەوشتی ناشیرین و نابووت و خراپ و زیانبەخش.

٢- پاك ڕاگرتنی زمانی:

هەڵبەتە زمان ئەو پارچە گۆشتەیە كە سەنتەر (مركز) ێكە چاكەو خراپەی پێ دەكرێ و لێیەوە هەڵدەقوڵێ، بۆیە زەروور وایە قوتابی وریای زمانی بێت لەكاری چاكەوە نەبێت بەكاری نەهێنێ، هەروەها بیپارێزێ لەو جۆرە قسەو گوفتارانەی كە لەڕیزی تاوانەكان هەژمار دەكرێن، لە زیان و تووڕەیی خوا خوا پەنامان بدات بەم لاوە هیچی تریان لێ ناكەوێتەوە و چاوەڕوان ناكرێ وەكو غەیبەت و بوختان و توانج و پلار و جنێو فرۆشی و دەم شڕی، قسەچنی و هێنان و بردنی، سوێند خواردنی درۆ بەخوا، سوێند خواردن بە غەیری خواو ..... تاد.

پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ فەرموویەتی:((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت))[1] واتە: هەر كەسێ باوەڕی بەخواو ڕۆژی دوایی هەیە؛ با قسەی چاك بكات، یا بێدەنگ بێت. بۆیە گوتراوە: (ئەگەر قسەكردن زیو بێت، نەكردنی زێڕە).

هەروەها (عبدالله ی كوڕی مەسعودیش خوالێی ڕازیبێ فەرموویەتی: ((والله الذي لا إله إلا هو ليس شئ احوج الى طول سجن من لساني)) واتە: سوێند بەو خوایەی كە بێجگە لە و پەرستراوێكی ڕاستەقینە نییە، هیچ شتێك ئەوەندەی زمانم پێویستی بە زیندانیكردنی زۆر نیە.

٣- دەم:

دەم یەكێكە لەو ئەندامانەی، كە پێویستە بە پاك و خاوێنی ڕا بگیرێ و بپارێزرێ لەهەرچی شتێكی بۆن ناخۆشە و خەڵكی ئازار دەدات، وەكو: (سیر و پیاز و توور و جگەرە)، ڕابەریشمان ﷺ دەفەرمووێت: ((من أكل البصل

١ - رواه مسلم بهذا اللفظ والبخاري بعضه.مسلم: ٤٨ .

والثوم والكراث فلا يقربن مسجدنا)).[1] بێگومـان بۆنـی جگـەرەش لـە خـوار بۆنـی ئـەوانی تـرەوە نی‌یـە و بگـرە رەنگــە ناخۆشــتریش بێــت، ســەرەرای هـەبوونی فـەتوای بەڵگـەداری چــەندین زانــای بــەتواناو ڕێزداریــش لەســەر حەرامیەتی جگەرە.

هەڵبەتە ئیسلامی پیرۆز، کە بەکارهێنانی سیواکی بە سوننەتێکی گـەورەو گرینگ داناوە، هەر بەمەبەستی پاك وخاوێنی دەم بووە، وەك لـەم بارەیـەوە خۆشەویست ﷺ دەفەرمووێ: ((السواك مطهرة للفم مرضاة للـرب))[2] واتـە: سیواك پاك کەرەوەیە بۆ دەم و رازیکەرە بۆ پەروەردیگار.

٤- جەستە (الجسد):

خـاوێن و پـاك راگرتنـی لاشـەش، بـەم چـەند شـتانەی خـوارەوە ئــەنجام دەدرێت..

أ- شووشتنی: وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((حق على كل مســلم أن يغتسل في كل سبعة أيام يوما))[3] واتە: مافێکە لەسەر هەموو موسـڵمانێك، کـە لە هەموو حەوت رۆژێك، رۆژێك خۆی بشوات.

ب- خـاوێن ڕاگرتنـی بـەرگ پۆشــاکی: لــەم بارەشــەوە پێشــەوامان ﷺ دەفەرمووێ: ((من إتخذ ثوباً فلينظفه))[4] واتــە: کـە جـل و بـەرگێکی پۆشـی و دەبەری کرد، با پاکی بکاتەوە.

ج- بۆن بەکار هێنان و خۆ بۆن خۆشکردن: وەك دەفەرموێت: ((غســـل الجمعة واجب على كل مُحْتلِم والسواك و أن يمس مـــن الطيـــب مـــا يقـــدر

---

١ - رواه مسلم: ٥٦٤

٢ - رواه البخاري تعليقا بصيغة الجزم فقال: وقالت عائشة - رضي الله عنها - والنسائي(١/ ١٠).

٣ - رواه البخاري (٨٥) ومسلم (٨٤٩) عن أبي هريرة رضي الله عنه.

٤ - رواه الطحاوي.

علیه))[1] واته: خۆشوردنی ڕۆژی جومعه پێویسته لەسەر هەموو بالغ بوێك، هەروەها سیواك کردن و خۆبۆنخۆش کردنیش بەپێی توانا[2].

٥- قوتابخانه:

قوتابخانه حوجره که شوێنی نیشتەجێبونی قوتابی فەقێ-یه، پێویسته زۆر بەچاکی پاك و خاوێن را بگیرێ و بپارێزرێ، چونکه پاك و خاوێن راگرتنی شوێنی تیانیشتەجێ بوون و ژینگه، هەم مەرجی تەندروستی مرۆڤه، هەمیش هێما و نیشانەی هۆشیاریيەتی، چاو ساغیشمان ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ((فنظفوا أفنيتكم، ولاتشبهوا باليهود))[3] واته: پێش دەرگاتان پاك رابگرن و لاسایی جولەکەکان مەکەنەوە واته لە پیسی و پۆخڵی و بێ سەرو بەریدا.

## چوار: دوانەکەوتن لەکاتی دیاریکراوی ئەنجام دانی نوێژەکان و دەرس خوێندن و سەعی کردن، نان خواردن هەروەها تێکڕای ئەرکەکانی سەرشانی:

سیفەت و رەوشتێکی تری قوتابی زانستە شەرعیەکان لە نێو قوتابخانەدا بریتیە لە دوانەکەوتن لە کات و ساتە دیاریکراوەکانی: نوێژەکان و دەرس خوێندن و سەعی کردن و هەروەها بە ئەنجام گەیاندن و جێبەجێ کردنی سەرجەم ئەو ئیش و کارانەی نێو قوتابخانه ، کەوا بە گوێرەی خشتەیەکی یەکسان و رێك و پێك، دابەش دەکرێت بە سەر قوتابیان، وەکو چای لێنان و چێشت ئامادەکردن وگەسك لێدان و شووشتنی قاپ و پیاڵه و تاد، چونکه مرۆڤی باوەڕدار لە سەرجەم ئەو کارو ئەرکانەی ئەنجامیان

---

١ - رواه البخاري ٨٧٩ و مسلم: (٦/ ١٣٠)

٢ - مەبەستیش لەم وحوبە داکۆکی و تەئکید کردنی زۆر بە خێری ( مستحب )ەیاتی کارەکەیە.

٣ رواه الترمذي

دەدات، ڕەچاوی ڕێك و پێکی دەکات چونکە پێغەمبەری پێشەوا ﷺ فەرموویەتی: (( إن الله يحب إذا عمل أحدكم عملا أن يتقنه))[1] واتە: بێگومان خوای مەزن حەز دەکاو پێی خۆشە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە کارو ئیشێکی ئەنجامدا بە ڕێك و پێکی ئەنجامی بدات..

هەڵبەتە ڕێك و پێکیش لەهەر ئیشێکدا بەوە بەرهەم دێت، کە لە کاتی دیاری کراوی خۆیدا دوانەکەوێ و ئەنجام بدرێت.

بۆیە قوتابی زانستە شەرعیەکان بە هیچ شێوەیەك ڕێگە بە خۆ نادات و لە خۆی ناوەشێنێتەوە، کە سستی و تەمبەڵی و قالب گرانی و دەستەوەستانی، کەسایەتی لەکەدار و ناشیرین بکەن و دوای بخەن لە ڕاپەڕاندن و ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەر شانی..

## پێنج: پاراستنی کتێب و خراپ و بێسەرو بەر نەکردنی:

پەرتووك ئەو سەرچاوە زانستیە گرینگ و بەپێزەیە، کەوا مرۆڤ لە هەڵدێرەوە ڕزگار دەکات و ڕاستەڕێی دەکات و وشیاری و زانایی و سەرفرازی بە مرۆڤ ئەبەخشێ، بۆیە نابێ و نەگونجاوە، کەوا کەمتەرخەمی لە هەمبەر بکرێ و خزمەتی نەکرێ و پاك ڕانەگیرێ ..

بێگومان پاراستن و خزمەت کردنی پەرتووکیش بەم شێوەیەی خوارەوە دەکرێت:-

أ- شوێنی دیاریکراوی هەبێت: واتە پێویستە پەرتووکخانەیەك یان هەر شوێنێکی کەشیاو و گونجاو بێت دیاری بکرێت، بۆ پاراستن و تێدا دانانی پەرتووك.

ب- هەروەها ئەگەر پێویست بوو بەرگ بکرێ و لەکاتی خوێندن و

---

١ - رواه أبو يعلى والعسكري.

خوێندنـەوەدا پارێزگـاری لـە پـەڕەكانی و بەرگەكـەی بكـرێ، بــە شـێوەیەك پەڕپووت نەكرێ و بە هێواشی و وریایی‌یەوە ئەم دیو و ئەو دیویان پێ بكـرێ بەتایبەت پەرتووكی كۆن و ناسك -.

ج- بێجگە لە ناوی خاوەنی و هــەندێ شـتی تـری پێویسـت نـەبێ چیـتری لەسەر نەنووسرێ و پیس نـەكرێ، ئـەوەی دەشنووسـرێ پێویسـتە ڕەچاوی خەت خۆشی تێدا بكرێ.

د- ئەگـەر قوتابخانـە حوجـرە پــەرتووكخانەی تایبــەتی بـۆ موتــالاو كۆكردنەوەی زانیـاری گشـتی هـەبوو، پێویسـتە یـەكێك لـە قوتابیـان دەسـت نیشان بكرێ بۆ سەرپەرشتی‌كردنی، بۆ ئـەوەی كـەوا هـەر كەسـێك بیـەوێ پـەرتووكیك وەر بگرێـت بـۆ خوێندنـەوە لـە سەرپەرشـتیاری پەرتووكخانـەوە وەری بگرێـت و بـە ئاگـاداری ئـەوەوە بێـت، هــەروەها چاكـتر وایــە بابــای سەرپەرشتیكار فۆرم و تێنووسێكی تایبەتی لەبەر دەست دابێت بۆ مەبەستی تۆماركردنی ناوی كتێبەكان لەگەڵ وەرگرەكانیان، هــەروەها مێـژووی بـردن و هێنانەوەیان و تاد .

## شەش: چۆنیەتی هەڵس وكەوت و رەفتاركردن لەگەڵ میواندا:

هەڵبەتە قوتابخانەیش یەكێكە لـەو شـوێنانەی كـەوا خـەڵكی و میوان زۆر رووی تـێ دەكـەن و هاموشـۆی دەكـەن، چونكـە پێگـەو نـاوەندێكی ئـاینی و زانسـتی و كۆمەلایـەتی و تـاد یـە. بەشـێكی گرینگیشــە لــە پێكهاتــەی كۆمەڵگەكـەمان، جـا بێگومـان پاراسـتنی حورمـەتی میــوان و بــەرزو بــەڕێز راگرتنی مافێكی شەرعیە وەك دەقە شەرعیەكانیش ئامازەی پێ دەدەن، بـۆ وێنە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكیدا دەفەرمووێ: (( من كان یؤمـــن بـــالله

واليوم الأخر فليكرم ضيفـــــه...))[1] واتـه: كەسێك باوەڕی بەخوا و دواڕۆژ هەیە، با ڕێزی میوانەکەی بگرێ.

بۆیە پێویستە کەوا قوتابیانی ئەم ناوەندە زانستییە ڕەچاوی ئەم رەوشتانەی خوارەوە بکەن.

## ١- پێشوازی کردن:

ڕەوشت و خووێکی تری قوتابی زانستە شەرعیەکان بریتییە لەوەی هەرکات هەست بکات کەوا کەسێك، یان کەسانێك بەڕێوەن و بەرەو قوتابخانەوە دێن دەستبەجێ بە پیریانەوە دەچێ و پێشوازیان دەکات و بەپێی لێوەشاوەیی ڕێزیان دەگرێت.

چونکە ئەمە بە سوننەتێکی پێغەمبەری پێشەوای خۆی ﷺ دەزانێ و بەشێوەیەکی عەمەلی پراکتیزە (تطبیق)ی دەکات، بۆ نموونە: ((عن عائشة – رضي الله عنها – قالت: ( قدِمَ زيدُ بنُ حارثةَ المدينةَ و رسولُ الله ﷺ – في بيتي فأتاهُ فقرع البابَ, فقام إليه النبيُّ ﷺ يَجرُ ثَوْبهُ فأعتنقه وقَبّلهُ))[2] واته: عائیشە دایکی ئیمانداران خوای لێ ڕازی بێت دەفەرموێ: – زەیدی کوڕی حاریثە لە سەفەرێك گەڕایەوە مەدینە پێغەمبەری خواش ﷺ لە ماڵی من بوو هاتە خزمەتی و پێغەمبەریش ﷺ هەستا بە پیریەوە چوو، عەبایەکەشی لەدوای خۆی ڕا دەکێشا، لە باوەشی گرت و ماچی کرد.

## ٢- ڕووخۆشی و گوفتاڕ شیرینی:

هەروەها لە دەمی پێشوازی و بە پیرەوەچوونی میوانەوە – قوتابی وەك سیمایەکی هەمیشەیی خۆی تابڵێ مرۆڤێکی ڕووخۆش و گوفتار شیرینە

---

١ – متفق عليه البخاري: ٦١٣٨, مسلم: ١٧٢٧

٢ – رواه الترمذي ٢٧٣٢و قال حديث حسن. بڕوانە (رياض الصالحين ) ص-٢٩٤

له هەمبەری دا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( لاتحقرن من المعروف شيئاً ولـــو أن تلقى أخاك بوجه طليق))[1] واتە: لەکاری پەسند و خێرو چاکە هیــچ شتێك بێ نرخ سەیر مەکە، ئەگەر هەر ئەوندەش بێت کە بە روویەکی گەش و کـراوە بگەی بە برای موسڵمانی خۆت.

٣- تەوقە کردن:

پاش ئەوەی کە بە روویەکی خۆش و گەش و کراوەو بە گوفتار و زمانێکی شیرینەوە بە پیریانەوە دەچیت و پێشوازی لێدەکەی، کـاتی بـە یەکگەیشـتن تەوقەی لە گەڵ بکە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:((ما مـــن مســـلمان يلتقيان فيتصافحان إلا غفر لهما من قبل أن يفترقا))[2] واتـە: دوو موسـڵمان کـە بـە یـەکتر دەگـەن و تەوقـە بکـەن، بـەر لـەوەی لەیـەك جیـا ببنــەوە لێیــان دەبووردرێ و خۆش دەبێ.

٤- لە لای سەرەوە دانیشتاندنی:

هـەروەها وا چاکـە میــوان لــە لای ســەرەوە دانیشــتێندرێ و بــۆ ئــەوێ فەرمووی لێ بکرێ، جوان و گونجاو نیـیە خاوەن ماڵ لە میوانەکەی وە پشــت کەوێ و لە سەرەوە دانیشێ، چونکە وا باوە لە نێو خەڵکی و پتریش لە گـەڵ رێز و حورمەت راگرتنی میوان یەك دەگرێتەوە.

٥- خواردن و خواردنەوە پێدانی:

میوان کە دانیشت پێویستە ئاو دوایش چایە، یان شتێکی تری پــێ بـدرێ بە پێی توانای ماددی قوتابخانــەو لێوەشاوەی میـوان، ئەگـەر میوانەکـە لـە دوورەوە هـاتبوو، یـاخود کـاتی ژەم نزیـك بـوو پێویسـتە بــۆ نــان خــواردن

---

١ - رواه مسلم (٢٦٢٦).

٢ - رواه أبو داود: (١٤/١٢١) ٥٢١٢

تەکلیفی لێ بکرێ.

**٦- بە تەنیا بە جێ نەهێشتنی:**

وا چاکە میوان بە تەنیا بە جێ نەهێڵدرێ، با قوتابیەك یان زیاتر لەلای دانیشن و دەوری چۆل نەکرێ، چونکە ئەو شێوە رەفتارە بێ رێزی لێ ئەفامرێتەوەو لە گەڵ رەوشتی میوانداریش تێك ناکاتەوە.

**٧- دڵ نەرەنجاندن و سەغڵەت نەکردنی بە هۆی قسە و پرسیاری نابەجێ:**

هەروەها نابێ میوان سەغڵەت(إحراج) بکرێ و دڵی بریندار بکرێ بە هۆی پرسیار و قسەی نابەجێ و نەگونجاو، ئینجا بە مەبەستی تاقیکردنەوەی بێ، یا هەر مەبەستێکی تر، نابێ دەمەقاڵێ و شەڕەقسەی لەگەڵ بکرێ و دڵ و هەست و نەستی بریندار بکرێ، چونکە شتێکی تابڵێی ناشیرین و نەگونجاوە لە گەڵ رەوشت و شێوەی هەڵس و کەوتی- قوتابی زانستە شەرعیەکان- تێك ناکاتەوەو جیاوازە لە بابای قوتابی ئەم ناوەندەیش ناوەشێتەوە.

**٨- بەڕێزەوە بەڕێکردنی:**

دوای ئەوەی میوان مۆڵەتی رۆیشتنی خواست و رۆیشت، وا چاکە لەدەمی رۆیشتنی دا، قوتابیەك یان زیاتر بە پێی لێوەشانەوەی میوان لە گەڵی بڕۆن و بە رێزەوە بەڕێ بکرێ.

ئێستاش زۆر بە کورتی و گوشراوەیی جۆرەکانی میوانی قوتابخانە ئەخەینە روو، کە بریتین لە:

١- زانایانی پایە بەرز: کە بۆ سەردانی مامۆستا، یان قوتابیان، یاخود بۆ هەر مەبەستێکی تر سەردانی قوتابخانە -حوجرە- دەکەن.

٢- قوتابی فەقێیان -: بۆ سەردان و بەسەر کردنەوە، یان جێگرتن دێن.

٣- کەس و کاری فێرخوازان، بەمەبەستی سەردان و لێپرسین سەر دەدەن.

٤- خەڵکی ناسراوی دەورووبەری مەدرەسە، وەك هاوڕێیەتی و دۆستایەتی و خۆشەویستی دێنە لای قوتابیان.

٥- خەڵکی ڕێبوار و نەناسراو.

تێبینی: أ- زەروورە لە هەر قوتابخانەیەکدا بۆ گفتوگۆو قسەکردن لە گەڵ میوان، قوتابیەکی چاپوك و وریا، یان چەند قوتابییەك تەرخان و دەستنیشان بکرێن، بێجگە لەوان کەسی تر بەم کارە هەڵنەستێ و خۆی لە قسان هەڵنەقورتێنێ، چونکە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((من حسن إسلام المرء تركه مالا يعنيه))[1].

ب- وا چاکە و پەسندە، کە خوێندکار هەر یەکێك لەو جۆرە میوانانەی باسمان کرد، بە ئەندازەی هەڵگرتن و لێوەشانەوەی خۆی ڕێزی بگرێ و خزمەتی بکات، وەك پێشەوای مرۆڤایەتی محمد ﷺ فەرموویەتی: (( أنزلوا الناس منازلهم))[2].

## حەوت: چۆنیەتی ڕەفتار کردن لە گەڵ هاوەڵ و برادەردا:

دیارە دۆست و برادەر دەوری کاریگەری هەیە لە سەر ژیان و ڕەوشتی مرۆڤ بە گشتی و بەتایبەت بابای خوێندکار و قوتابی، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە زوو ڕەوشت یان سیفەت و خوو لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر نەقڵ دەبێ و وەردەگیرێ و لەیەکەوە نزیك دەبنەوە، بۆیە زەروورە فێرخوازی زانستە شەرعیەکان- دۆست و هاوەڵی وا بۆ ژیانی دەستنیشان بکات کە

١ - رواه الترمذي: ٢٣١٧،٢٣١٨ .

٢ - رواه أبو داود: ٤٨٤٢

خاوەن ئامانج بێ، تاكو هاریكاری بێت بۆ گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەكەیان، خاوەنی بیروباوەڕ و رەوشت و خووێكی رەسەنیش بێت، تا كو لە پەروەردیگاریەوە نزیكی بكاتەوە و هاوكاری و هاریكاری بێت بۆ مەبەست و ئاوات و خواستەكانی، چونكە هەموویان وەك یەك نین بەڵكو هەمە جۆر و هەمە چەشنن بۆ وێنە وەك ئەوەی هەندێ لە زانایان دابەشیان كردووە بۆ ئەم سێ بەشەی خوارەوە:

١- هاوڕێ بۆ سود وەرگرتن.

٢- هاوڕێ بۆ چێژ و خۆشی وەرگرتن.

٣- هاوڕێی چاكەویست.

یەكەم و دووەمیان دۆستی كاتین بە نەمانی مەبەست و خواست و سوود وەرگرتنەكەیان، پەیوەندی دۆستایەتی هەڵدەوەشێننە، بەڵام سێیەمیان جێی گرنگی پێدانەو شایەنی دۆستایەتی كردنە، چونكە تەنها ئەویان دۆستێكی راستگۆو راستەقینەیە، لەم بارەیەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (( الرجل على دين خليله فلينظر أحدكم من يخالل))[1] واتە: مرۆڤ لەسەر ئایینی دۆست و خۆشەویستەكەیەتی، جا با هەر یەكێك لە ئێوە سەرنج بدا داخوا دۆستایەتی كێ دەكا. هەروەها ئیمامی عەلی كوڕی ئەبی تالیبیش خوا لێی رازی بێ لەم بارەیەوە فەرموویەتی:( أصدقاؤك ثلاثة، وأعداؤك ثلاثة، فأصدقاؤك صديقك، وصديق صديقك، وعدو عدوك، وأعداؤك ، عدوك، وعدو صديقك، وصديق عدوك ) واتە: دۆستەكانت سێن و دوژمنەكانیش سێن: دۆستەكانت بریتین لە : دۆستی خۆت، دۆستی دۆستت، دوژمنی دوژمنت،

١ - رواه أبو داود: ٤٨٣٣ والترمذي ٢٣٧٨ بإسناد صحيح.

دوژمنەکانیشت ئەمانەن: دوژمنی خۆت، دوژمنی دۆستت، دۆستی دوژمنت.[1]

پێویستە زۆر بە رێکی و جیددیەوە هەق و مافی برایەتی ئیمانی لە گەڵ سەرجەم دۆست و هاوەڵەکانی جێبەجێ بکات، بەڵام لەگەڵ هاوڕێی قوتابی فەقێ- یەکانی لە پێش هەموویانەوە، بەشێوەیەك قازانج و زیان و خۆشی و ناخۆشی برا قوتابیەکانی پێ وەك هی خۆ بن و وەك هی خۆ حیسابیان بکات، وەك پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ دەفەرمووێ: ((لایؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه مایحب لنفسه))[2] واتە: ئیمانی هیچ کامێکتان تەواو نابێ، تاکو هەر چیەك بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براکەشی پێی خۆش بێ.

جا پیسترین دەردو ڤایرۆسێك کە تەندروستی برایەتی رەسەن و راستەقینە ناساغ دەکات، میکرۆبی ئیرەیی(الحسد)ە، بۆیە هەقی خۆیەتی قوتابی بەڕێز زۆر ئاگادار و وریای خۆی بێ نەبادا دووچاری نەخۆشی یەکی ئاوا کوشندە و زیانبەخش بێت، کە بێگومان دوایش چارەسەری ئەستەمە و کۆششی زۆری دەوێ، جا توخوا ئەگەر زانستخوازان و زانایان لە نێو خۆدا براو تەبا نەبن و قازانج و زەرەری یەکتر بە هی خۆ نەزانن، ریز لە یەکتر نەگرن لە پاشملە بەرگری لە یەکتر نەکەن و زەم و غەیبەتی یەکتر بکەن و بوغز و ڕق و کینە لە یەکتر بکێشن، دەبێ موسڵمانان کە ئاوا پێشەوایەکیان هەبن، چیان بەسەر بێ و کێ دەردی مامۆستا و پێشەوایان چارە بکات و زام و برینیان تیمار بکات و ئامۆژگاری پێویستیان بکات، وەك شاعیریش دەڵێ:

(یاعلماء الإسلام یا ملح البلد ماذا یصلح الملح إذا الملح فسد)؟!!

---

١ - من أقوال الصحابة والتابعين./ ص-١٣١ و نهج البلاغة/ج٣-ص-٢٠٧

٢ - متفق عليه: البخاري: ١٣, مسلم: ٤٥

**هەشت: چۆنیەتی رەوشتی خواردن و خواردنەوە و خەوتن و لەخەو هەستان.**

دیارە پەیامی پیرۆزی ئیسلام پەیامێکی هەمەلایەن و گشتگیرە، تێکرای بوار و لایەنەکانی ژیانی مرۆڤی گرتۆتە خۆی، هیچ بوارێك لە بوارەکانی فەرامۆش و پشت گوێ نەخستووە، تەنانەت باری لایەنی ورد و بچووکیشی لە ژیانی مرۆڤ رێك خستووە و سیستەمی تایبەت و گونجاوی بۆ دارشتووە، جا لایەنێکیش لەو لایەنانەی، کە زۆر بەتۆکمە و بە رێکیەوە باسی لێوە کراوە و روون کراوەتەوە ، چۆنیەتی رەوشتی خواردن و خواردنەوە و خەوتن و هەستان لەخەو و هتد کە راستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی مرۆڤەوە هەیە، جا بۆ ئەوەی فێرخوازانی -زانستە شەرعیەکان لەم لایەنەشەوە نموونەی کردەیی ئەم چەند خاڵەی دوایی ئەخەینە روو:

**یەك: خواردن و خواردنەوە:**

١- ناوی خواﷻ هێنان و ( بسم الله ) کردن:

بەڵێ واچاکە و پەسندو سوننەتە، کە لە سەرەتا و دەستپێکی نان خواردنەکە (بسم الله) بکرێ چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((سم الله))[١] واتە: ناوی خوا بێنە و (بسم الله) بکە، وە ئەگەر لە سەرەتاوە لە یاد کرا، پێغەمبەر ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرمووێ: ((إذا أكل أحدكم فليذكر أسم الله تعالى, فإن نسي أن يذكر أسم الله تعالى في أوله فاليقل: (بسم الله أوله وآخره))[٢] واتە: ئەگەر یەکێك لە ئێوە خواردنێکی خوارد با (بسم الله) بڵێ، خۆ ئەگەر لەسەرەتاوە لە یادی چوو، هەر کاتێ بیری کەوتەوە بابڵێ (بسم الله أوله وآخره).

---

١ - البخاري: ٥٣٧٦، مسلم: ٢٠٢٢

٢ - رواه أبو داود(١٠ ٢٤٠،٢٤١) والترمذي

پاشان واته: دوای (بسم الله) کردن، ئەم دوعایە بخوێندرێ: ( اللهم بارك لنا فيه وأطعمنا خيرا منه).[1]

**٢- بەدەستی ڕاست خواردن:**

هەروەك چۆن سوننەتە کارە چاك و بەرێزەکان بەدەستی ڕاست ئەنجام بدرێن و دەستی ڕاست لە پێشەوە بێت، وەك دەستنوێژ و غوسل و تەیەموم جل و بەرگ لەبەکردن و پێڵاو لەپێکردن و چوونەمزگەوت و سیواك کردن و نینۆك کردن و تەوقەکردن و هاتنەدەر لە ئاودەست و بەخشین و وەرگرتن تاد، بە هەمان شێوەش خواردن و خواردنەوە وا سوننەتە، وەك ﷺ دەفەرموویّ: ((وكل بيمينك..)).[2]

**٣- لەبەردەم خۆ خواردن و دەست درێژ نەکرن بۆ ئەم لاو ئەولای قاپەکە:**

هەروەها مرۆڤ پێویستە لەبەردەم خۆ و پێشەوەی خۆ بخوات و دەست بۆ ئەم لا و ئەو لا و ناوەڕاستی قاپەکە درێژ نەکات ، وەك خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموویّ: ((وكل مما يليك))[3] چونکە کارێکە هەم پێچەوانەی سوننەت و ڕەوشتی پێغەمبەرە ﷺ هەمیش کارێکی قێزەون و ناشیرینە. ئەمەش لەکاتێکدا ئەم کارە ناپەسەندە، گەر چەند کەسێك لەسەر یەك قاپ بخۆن، بەڵام گەر کەسێك هەر قاپێکی تایبەتی بۆ دانرابو، بۆی هەیە دەست بگێڕێ.

**٤- عەیب و ڕەخنە نەگرتن لە خواردن:**

ڕەوشتێکی تری قوتابی ئەوەیە هەرگیز عەیب و ڕەخنە لە خواردن ناگرێ، بەڵکو ئەگەر ئارەزووی لێبێ دەیخوات ئەگینا بێدەنگ دەبێ، چونکە ئەمە

---

١ - أخرجه الترمذي.

٢ - متفق عليه: البخاري: ٥٣٧٦، مسلم: ٢٠٢٢

٣ - متفق عليه، البخاري: ٥٣٧٦، مسلم: ٢٠٢٢

ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ بووە، وەك ئەبی هورەیرە خوای لێ ڕازی بێ دەفەرمووێ: ((ماعاب رسول الله ﷺ طعاما قط, إن أشتهاه أكله, وإن كَرِهَهُ ترَكَهُ)).[1] واتە: پێغەمبەری خواﷺ هەرگیز ڕەخنەی لە خواردن نەگرتوە، گەر ئارەزوی لێبا دەیخوارد، گەر حەزی پێ نەکردبا وازی لێهێناوە و نەیخواردوە.

٥- پاڵنەدانەوە لەکاتی خواردن:

چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((لا آكل متكئا))[2] واتە: بە پاڵدانەوە نان ناخۆم.

## ٦- دەست شوشتن پێش دەستپێکرن دوای تەواو بوون و دوعای کۆتایی خوێندن:

هەروەها پەسند وایە بەر لەوەی دەست بکرێ بە خواردن و دوای لە خواردن بوونەوە و تەواو بوونیش دەست و دەم بشوشترێ، چونکە هەم نیشانەی پاك و خاوێنییە، هەمیش کارێکی بەسوودە بۆ تەندروستی مرۆڤ، سوننەتیشە دوای تەواوبوون ئەم دوعایە بخوێندرێ ((الحمد لله الذي أطعمني هذا ورزقنيه من غير حول مني ولا قوة)).[3]

٧- ئەدەب و ڕەوشتی ئاوخواردنەوە:

لەم خاڵی حەوتەمەدا هەوڵ ئەدەین بە کورتی چۆنیەتی و ئەدەب و ڕەوشتی ئاو خواردنەوە بخەینە ڕوو:-

أ- سوننەت وایە ئاو بە سێ قوم بخورێتەوە: چونکە ئەنەس خوالێ ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ((كان يتنفس في الشراب

١ - متفق عليه، البخاري:٥٤٠٩ ، مسلم: ٢٠٦٤

٢ - رواه البخاري: ٥٣٩٨، ٥٣٩٩

٣ - رواه أبو داود: ٤٠٢٣ والترمذي: ٣٤٥٨

ثلاثا))[1] واتە: لە خواردنەوە دا سێ جار هەناسەی دەدا، واتە: لــە دەرەوەی جامەکە .

ب- لەلای راستەوە دەستپێ کـردن: ئەگـەر یـەکێك ئـاو، یـان هـەر خواردنەوەیەکی‌تر بگێڕێ و بدا بە ئامادەبوانی مەجلیس و کۆڕ و کۆمەڵێك، وا سوننەتە لە لای راستەوە دەست پـێ بکـات، چونکە ئەنەس خـوای لێ ڕازیبێ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ شیری تێکەڵ بە ئاویان بۆ هێنا، لە لای راست ئەعرابی‌یەك دانیشتبوو لای چەپیشی ئەبوبەکر خـوای لێی رازی بـێ خـۆی خواردیـەوە ئینجـا دای بـە ئەعرابیەکـە و فەرمووی: ((الأيمن فالأيمن))[2] واتە: لای راستە پاشانیش تا کۆتایی

ج- نەخواردنەوە بە زاری دۆلکە یان هەر ئامرازێکی تری ئاو هێنـان و ئـاو تێدا هەلگرتن:

بەڕاستی خوو و خەسڵەتێکی قێزەون و ناشیرینە کە یەکێك دەم بە دۆلکە و ئامرازەکانی تری ئاو و خواردنەوە وەدەنێ، بەبێ بەکارهێنانی پەرداخ یانـە جامی ئاو پێ خواردنەوە، چونکە دەبێتە مایەی تەبیعەت و سروشت تێکدانی ئەوانی تر، پێغەمبـەری پێشـەواش ﷺ نـەهی کـردووە لـەم کـارە، وەك ئـەبو هورەیرە -رەزای خوای لێبێ دەڵێ: ((نهى رسول الله ﷺ أن يشرب مـن في السقاء والقربة))[3].

د- فوو تێدا نەکردنی: کـارێکی چـاك و پـاك و پەسـند نیـە، فـوو لـە هـەر خواردن و خواردنەوەیەك بکـرێ، پێغەمبــــەری خـواش ﷺ ئەمـەی قەدەغـە کردووە، وەك ئیبنو عەبباس خوا لێیـــان رازی بێ دەلێ: ((إن النــبي ﷺ

---

١ - متفق عليه، البخاري: ٥٦٣١ ، مسلم: ٢٠٢٨ واللفظ له.

٢ - متفق عليه، البخاري: ٢٣٥٢، مسلم:٢٠٢٩

٣ - متفق عليه، البخاري: ٥٦٢٣

نهى أن يتنفس في الإناء أو ينفخ فيه))[1].

هـ- به پێوه نەخواردنەوه: وا باشه و سوننەته ئاو تا بكرێ به دانیشتنەوه بخورێتەوه چونكه ئەنەس خوالێی ڕازیبێ دەگێڕنەوه كه پێغەمبەرﷺ : ((نهى أن يشرب الرجل قائمـــاً))[2] بـەلام دروستیشـه بـه پێـوه بخورێتـەوه، چونكه چەند فەرموودەیەك لەم بارەیەوه هاتوون، بۆ نموونه: ئیبنو عباس خوا لێیان ڕازی بێ دەلێ: ((سقيت النبي ﷺ من زمزم فشرب وهو قائم))[3].

و- بابای ئاوگێڕ له پاش هەموویانــەوه بخواتــەوه: دیسـان سوننەت وایـه ئـــەو كەســـەی خواردنەوەكــه دەگـــێڕێ دوای هـــەموان بخواتـــەوه، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((ساقي القوم آخرهم)) يعنى شرباً-[4].

دوو: خەوتن و لەخەو هەستان:

أ- حوزیفه خوا لێی ڕازیبێ دەلێ: پێغەمبەر ﷺ كه بۆ خەوتن دەهاتـه سەر جێ، دەستی دەخسته ژێر كولمەی ئەیفەرموو: ((باسمك اللّهم أمـــوت وأحيا))، كاتێكیش لەخەو هەلدەستا ئەیفەرموو: ((الحمد لله الذي أحيانا بعــد ما أماتنا و إليه النشور))[5].

ب- لەسەر زگ خـەوتن چـاك و پەسـند نیه، چونكـه خـوا تـوڕه دەكـات، پێغەمبەرﷺ دەربارەی فەرموویەتی: ((إن هذه ضجعة يبغضها الله))[6].

---

١ - رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح، الترمذي:١٨٨٨

٢ -رواه مسلم:٢٠٢٤

٣ - متفق عليه، البخاري ٥٦١٧ ، مسلم:٢٠٢٧

٤ - رواه الترمذي ١٨٩٤

٥ - رواه البخاري ٦٣١٢، ٦٣١٤ عن حذيفة.

٦ رواه أبو داود بإسناد صحيح: ٥٠٤٠ واللفظ له.

## سێ: ڕەوشتی ئیزن وەرگرتن (الأستئذان):

ڕەوشت و خووێکی تری قوتابی زانستە شەرعیەکان بریتیە لەوەی، کە بەبێ ئیزن و مۆڵەت وەرگرتن وەژوور هیچ شوێنێك ناکەوێت ، مەگەر شوێنێکی وا بێت ئیزن وەرگرتنی گەرەك نەبێ، وەك شوێنە گشتیەکان، چونکە خوای مەزن دەفەرموێ: ﴿ يأيها الذين آمنوا لاتدخلو بيوتا غير بيوتِكم حتى تستأنسوا وتسلموا على أهلها ﴾[1].

ئەمەش چەند خاڵێك بە کورتی لە بارەی ڕەوشت و چۆنیەتی ئیزن وەرگرتن:

أ- سێ جار لە دەرگەدان: وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((الأستئذان ثلاث, فإن أذن لك, وإلا فارجع))[2] واتە: ئیزن وەرگرتن سێ جارە، ئەگەر ئیزنیان دای، ئەگینا بگەڕێوە.

ب- لە دەرز و کون و کەلەبەرەکان تەماشانەکردنی ژوورەوە: دروست نیە و کارێکی ناپەسندە کە لە کون و کەلەبەر و دەرزی دەرگاوە تەماشای ژوورەوە بکرێ، بەڵکو پێویستە لەلای ڕاستی دەرگاوە یانە لای چەپیەوە ڕاوەستێ، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((إنما جعل الأستئذان من أجل البصر))[3] واتە: کە ئیزن وەرگرتن داندراوە تەنها بۆ خاتری چاوە.

ج- سەلام کردن: ڕەبعی دەڵێ: پیاوێك لەهۆزی (بەنی عامر) بۆی گێڕاینەوە جارێك لە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای ئیزنی کردبوو، تەنها بەوەندەی گووتبووی، بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەری خواشﷺ بە

---

١ - النور ٢٧

٢ - متفق عليه،البخاري: ٦٢٤٥، مسلم:٢١٥٣ واللفظ له.

٣ - متفق عليه، البخاري: ٦٢٤١واللفظ له ،مسلم: ٢١٦٥

خزمەتكارەكەی فەرموو: برۆ ئەمە فێری رەوشتی ئیزن وەرگرتن بكە، پێی بڵێ با بڵێ: السلام عليكم، بێمە ژوورێ؟ پیاوەكەش گوێی لێبوو گوتی (السلام عليكم) بێمە ژوورێ، پێغەمبەریش ﷺ ئیزنی داو هاتە ژوورەوە.[1]

د- لە كاتی لە دەرگەدان گەر پێیان گوت، كێیە؟ ناوی خۆی بڵێ ، نەڵێ منم، چونكە جابیر خوا لێی رازی بێت. دەڵێ: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەرگاكەم دا، فەرمووی: كێیە؟ گوتم: منم، فەرمووی أنا، أنا) واتە ( منم، منم) وەك بڵێی پێی ناخۆش بوو[2].

## چوار: ئەدەب و رەوشتی پژمین و باوێشك:

أ- پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێ ئەگەر یەكێكتان پژمی، با بڵێ (الحمد لله) با براكەشی یا هاوەڵەكەی پێی بڵێ: ( يرحمك الله) كاتێكیش وای پێ گوترا لە وەڵامدا بابڵێ: ( يهديكم الله ويصلح بالكم)[3].

ب- بەڵام ئەگەر ( الحمد لله )ی نەگوت سوننەت نییە پێی بگوترێ: (يرحمك الله )، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی ((فإن لم يحمد فلا تُشَمِتوُهُ))[4].

ج-كاتی پژمین دەستت بخە سەر دەمت : ئەبو هورەیرە خوای بێ رازی بێ دەڵێ: ((پێغەمبەری خوا ﷺ كە دەپژمی دەستی یان جلی ئەخستە سەر زاری و دەنگی نزم دەكردەوە))[5].

---

١ - رواه أبو داود بإسناد صحيح: ٥١٧٧

٢ - متفق عليه، البخاري: ٦٢٥٠

٣ - رواه البخاري: ٦٢٢٤

٤ - رواه مسلم ٢٩٩٢

٥ - أبو داود: ٥٠٢٩ ، الترمذي: ٢٧٤٥

د-دەربارەی باوێشکیش پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( إذا تثائب احدكم فليمسك بيده على فيه، فإن الشيطان يدخل))[1]. واتە: کاتێك یەکێکتان باوێشکی هات، با دەستی بە دەمی‌یەوە بگرێت، چونکە شەیتان دەچێتە ژوورەوە وا چاکە تا بکرێ بگێڕدرێتەوە، چونکە دەفەرموێ: ((إذا تشاءب أحدكم فليرده ما استطاع)).[2]

## پێنج: رەوشتی قسەکردن:

فێرخوازی زانستە شەرعیەکان لە ئان و ساتی قسەکردنیش لە خەڵکی تر جیایە و شێوە و شێوازی تایبەتی خۆی هەیە وەك:

أ- قسەخۆش و رووگەشە و قسەکانی بەجێ و لەجێ وبە سوودن:

چونکە خوای مەزن دەفەرمووێ: ﴿ وقولوا للناس حسنا ....﴾[3] واتە قسەی چاك و جوان لەگەڵ خەڵکی بکەن.

بۆیە قوتابی بەڕێز کاتێ کە لە گەڵ خەڵکی دەدوێ، کامە قسەو وشەی چاکە و کامە تەعبیر جوانە و گونجاوە دەڵێ و بەکار دەهێنێ، خۆی دوور دەگرێ لەهەر وشەو قسەیەکی دڵ بریندارکەر و دڵ شکێن ، کە دەبێتە هۆی تێکدانی پەیوەندی و برایەتی نێوان دوو موسڵمان، پێشینانمان ئاوا بوون بۆیە خەڵکی تامەزرۆی بینینیان بوون و دەوریان دەدان و لێیانەوە بەهرەمەند دەبوون بۆ وێنە:

لە باس و وەسفی (عمر بن الحارث المصري) دا دەڵێن: ( كان يخرج من داره فيرى الناس صفوفا يسألونه عن القرآن والحديث والفقه والشعر والعربية

---

١ - رواه مسلم: ٢٩٩٥

٢ - رواه البخار: ٦٢٢٦

٣ - البقرة/ ٨٣

والحساب) واتە: کە لە ماڵەوە دەچووە دەرێ دەیبینی خەڵك بەچەند ریزێك وەستاون، دەربارەی قورئان و سوننەت و شەرع و شیعر و زمانی عەرەبی و بیرکاری پرسیاریان لێ دەکرد.

ب- هێمن و لەسەرخۆ و نەرم و نیانە، تاڵوکە و پەلەپەل ناکات:

وەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ کە عادەتی وابووە: ((كان إذا تَكلَّمَ بكَلِمَةٍ أعادَها ثَلاثاً حتى تُفهَمَ عنه))[1] واتە: پێغەمبەر ﷺ کە قسەیەکی دەکرد سێ جاران دووبارەی دەکردەوە تاوەکو تێی بگەن و لێی حاڵی بن.

هەروەها عائیشەی دایکی ئیماندارانیش خوالێی رازی بێ دەڵێ: ((كان كلام رسول الله ﷺ كلاما فصلاً يفهمه كل من يسمعه))[2] واتە: پێغەمبەر ﷺ قسەکانی روون و یەکەیەکە بوون و هەر کەسێك بیستبای تێی دەگەیشت.

ج- وشە و تەعبیری روون و ئاسان بۆ تێگەیاندنی بەرامبەری بەکار دەهێنێ و هەوڵی دەرخستنی زانیاری و شارەزایی خۆی نادات:

خەسڵەت و رەوشتێکی تری فێرخوازی رەسەن ئەوەیە، کە بەپێی بۆ گونجان و بۆ رەخسان هەوڵ دەدا و دەخەفتێ لە تێگەیاندنی بەرامبەرەکەی بە شێواز و وشەو تەعبیری روون و ئاسان، چونکە ئەمە پیشەی پێشینانی صالح (السلف الصالح) بووە، وەك (الأحجمي)، دەڵێ: (كنت إذا سمعت أبا عمرو بن علاء يتكلم ظننته لايعرف شيئاً، كان يتكلم كلاما سهلاً) واتە کاتێك گوێم لە (أبو عمرو بن علاء) دەبوو قسەی دەکرد پێم وابوو هیچ نازانێ، زۆر بە روونی و سادەو ئاسانی قسەی دەکرد. بێگومان (ابو عمرو بن علاء)یش مامۆستای قورئان خوێنەکان و زمانی عەرەبیش بوو.

---

١ - رواه البخاري: ٩٥

٢ - رواه أبو داود ٤٨٣٩

د- لە دەمی موناقەشە و وتووێژدا تاکە ئامانج و پاڵنەری ڕەزامەندی خودا و دەرخستنی هەق و ڕاستی‌یە، هەرگیز لەهیچ کاتێکیشدا تفەنگ ناگرێتە تاریکی، بەبێ بەڵگە و شارەزایی تەواو خۆی لە قەرەی هیچ بابەتێك نادات و هەق و ڕاستی لەکام لاوە بەدەر بکەوێ وەری دەگرێ و دەیسەلمێنێ و ڕەتی ناکاتەوە.

ه- تووتی ئاسا هەرچیەك کە دەیبیستێ دووبارەی ناکاتەوە و بەرەنگاری پڕوپاگەندە و ئیسرائیلیاتە تازەکان دەبێتەوە:

ڕەوشتێکی تری پەسندو پێویستی خوێندکاری زانستە شەرعیەکان بریتیە لەوەی، کە زۆر وشیار و بێدارە لە بەرامبەر قسە و قسەڵۆك و پڕو پاگەندە و قالە و قیلی هەمەجۆر، شوێن هیچێك لە فاك و فیك و بانگەشەیەك ناکەوێ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((كفى بالمرء كذباً أن يُحدِّثَ بكُلِّ ماسمِع))[1] واتە: مرۆڤ ئەوەندەی درۆکردن بەسە، کە هەرچی‌یەکی بیست باسی بکات وبیگێڕێتەوە.

بە تایبەت ئەگەر پەیوەندی بە زانا و پێشەوا و زانست پەروەرانەوە هەبێت، ئەو کات پێویستترە، چونکە مادام ئەوان پلەو پایەیان بەرزتربێ لە خەڵکی تر، دەبێ زیاتریش حورمەت و ڕێزیان ڕا بگیرێ، لەم بارەشەوە گوتراوە: (إن لحوم العلماء مسمومة) واتە: گۆشتی زانایان ژەهراویە.[2]

---

١ - رواه مسلم، ٥

٢ ئەم بەشی پیشەمە بە دەستکاری‌یەکەوە لە کتابی (ریاض الصالحین) وەرگیراوە.

# بەشی شەشەم

## ئایا زانست لەگەڵ پارە و پووڵ و سامان بەراورد دەکرێ؟

دیارە زانست بریتیە لە و بەخششە پیرۆز و گران بەهایەی، کە خوای بە بەزەیی ئەیبەخشێ بە مرۆڤگەلێك لە نێو سەرتاپای مرۆڤایەتی، هۆکارێکی یەکجار گرینگ و کاریگەریشە بۆ راستەڕێ بوون و کامەران بوونی هەڵگرانی و وەر چەرخاندنی کۆمەڵ و کۆمەڵگا بەرەو ژیانێکی ئاسوودە و باشتر..

ئینجا هەڵبەتە وەك گوتراوە (چەم بێ چەقەڵ نابێت) لە نێو زانستخواز و زانست پەروەرانیش، کەسانێك هەن کە لە ماهیەت و چیەتی زانیاری و زانستخوازی حاڵی نەبوون، یانە ئەگەر حالیش بن وبشفامن، چونکە خاوەن نەفسێکی نزمن و زانا و زانستخوازی رەسەن (أصیل) نین، بازرگانی بە زانیارییەوە دەکەن، بازاڕی ڕەشی پێ گەرم دەکەن، بە ئومێدی دەستکەوتنی چەند پارەیەکی قەڵپ و ئافەرینێکی نادروست و نابەجێ، بێ ئاگا لەمە، کە زانستەکەی خۆی گران بەهاترین و بە قیمەتترین سامان و سەرمایە و دەستکەوتێکە ، هەرگیز لەگەڵ ماڵ و سامان و دەستکەوتی تر بەراورد ناکرێ و ناخرێتە تای تەرا زوویەکەوە

بۆیە دەبینین زانا ڕەسەنەکان ئامادەیی‌یان نەبووە زانیاریەکەیان بە هیچ شتێك بگۆڕنەوە و سەودا و مامەڵەی پێوە بکەن، بەڵکو ئەمە بیرو بۆچوونیان بووە.. (یەحیای کوڕی یەمان) گوتوویەتی: گوێم لە سوفیانی ثەوری بوو رەحمەتی خوایان لێ بێت دەیفەرموو: (العالم طبیب الدین والدرهم داء الدین، فإذا أجتر الطبیب الداء إلیه متی یداوي غیره ! !) واتە: زانای ئیسلام دکتۆر و

پزیشکی ئایینە و پارە و پوولیش دەردیەتی، جا ئەگەر دکتۆر خۆی دەردی بۆلای خۆی پەلکێشکرد، کەی و چۆن چارەسەری خەڵکی تر دەکات[1]؟!.

ئینجا بۆ زیاتر بەرچاو روونی و روون کردنەوەی مەبەستەکەمان ئەم چەند خاڵ و دێرەی خوارەوە دەخەینە روو:-

زانای پایەبەرز (إبن القیم) لە کیتابە بە پێز و بە هێزەکەی (مفتاح دار السعادة) دا (٤٠)چل خاڵ و لایەنی خستۆتە روو، دەربارەی گەورەیی و فەزلی عیلم بە سەر ماڵ و سامانەوە، ئێمەش هەندێکیان بە گوشراوی ئەخەینە رووی ئێوەی ئازیز، بە ئومێدی کەلك لێ وەرگرتن و لێ بەهرەمەند بوون..

یەك: عیلم و زانست بۆماوە(میراث)ی پێغەمبەرانە علیهم الصلاة والسلام ، بەلاّم هەرچی پارە و پوول و سامانە میراتی پادشا و دەوڵەمەندەکانە، وەك ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەم راستی‌یە دەدات، کە دەفەرمووێ: ((إن العلماء ورثة الأنبیاء، وان الأنبیاء لم یورثوا دینارا ولا درهما إنما ورثوا العلم, فمن أخذه أخذ بحظ وافر))[2] واتە: بێگومان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، دیارە پێغەمبەرانیش زێڕ و زیویان بە میرات بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو زانستیان کردۆتە میرات، جا هەر کەسێك ئەو میراتی زانستە وەر بگرێ ئەوە بێگومان پشك و بەشێکی چاکی پێ براوە.

دوو: زانیاری پاسەوانی زانا و هەڵگرانی دەکات و دەیانپارێزێ، بەلاّم هەندێ خاوەن ماڵ دەبێ چاوی لە ماڵ و سامانەکەی بێت و بیپارێزێ و ئاگاداری بێت، کە ئەمەشیان خۆی لەخۆیدا گرفت و خەم و خەفەتێکە، وەك گوتراوە: (العلم یحرسك وأنت تحرس المال).

---

١ - مەبەست ئەو پارەو پوولەیە کە لە ریگای نامەشروع و لەسەر حیسابی دین پەیدا دەکرێت.

٢ - رواه أحمد وأبوداود والترمذي وابن ماجه.

سێ: ماڵ و سامان بە بەخشین و خەرج کردن کەم دەبێتەوە و بەرەو نەمان دەچێت، کەچی زانست و زانیاری، تا زیاتر ببەخشێ گەشە دەکا و زێدەتر دەبێت، زانا تا لەزانستەکەی ببەخشێ هێز و توانای زانستی بەرجەستەتر و زێدەتر دەبێ، بەهۆی راگەیاندن و گوتنەوەی و خەڵك فێرکردنی، بێگومان زەکاتی زانیاریش دوو رێگای هەیە: یەکیان فێرکردن، دووەمیان: کار پێ کردنی..

وەك هەندێ لە زانایانی پێشین (السلف) گوتوویانە: (کنا نستعین علی حفظ العلم بالعمل بە) واتە: ئێمە زانست بە کار پێ کردنی دەپارێزین، هەندێکیش گوتوویانە: (یهتف العلم بالعمل فإن أجابە حل وإلا أرتحل)[1] واتە: زانیاری بانگی کردەوە دەکات، جا ئەگەر وەڵامی دایەوە دەمێنێتەوە، ئەگینا بار دەکات.

چوار: خاوەن ماڵ کاتێ کە دەمرێ ماڵ و سامانەکەی لەگەڵ ناچێ و لێی جیا دە بێتەوە هاورێیەتیەکەی دەپچڕێ، بەڵام زانست و زانیاری دوای مردنیش لەگەڵ زانا بەردەوام دەبێ، لە گۆڕیشدا هاورێیەتی دەکات و کەلکی بۆ دەبێ و لەگەڵیا دەچێتە گۆڕ، بۆیە پێشینانمان دەستیان هەڵنەدەگرت لە داواکردنی زانیاری و بەڵکو هەوڵی بەردەوامیان بۆ دەدا تا ئاستێك جارێك پرسیار لە (عبدالله بن مبارك المروزی) کرا کە ئایا ئەگەر دوای مردن زیندووکرابایەوە چیت دەکرد؟ گوتی: (أطلب العلم حتی یأتینی ملك الموت مرة ثانیة) واتە: دوای زانیاری دەکەوتم تا بۆ جاری دووەم فریشتەی گیان کێشان دەهاتەوە لام!.

پێنج: زانیاری دادوەر(حاکم)ە بەسەر سەروەت و سامان و دادوەری دەکات بە سەریەوە، بەڵام هەرچی ماڵ و سامانە دادوەری ناکات بەسەر

---

١ - ئەم فەرموودەیە هی ئیمامی عەلیە - خوا لێی رازی بێ -

زانستەوە.

شەش: عیلم و زانست پادشا و کاربەدەست و خەڵکی تریش پێویستیان پێی هەیە، بەڵام هەرچەندی پارەو پوول وماڵ و سامانە بەتەنها خەڵکی هەژارو نەبوو و کەم دەرامەت پێویستیان پێی هەیە، بۆیە دەبینین زانا رەسەنەکان بەدرێژایی مێژوو لەگەڵ ئەوەی کە پێویست و کەم دەرامەتیش بوون، کەچی رێگای نەفس بەرزی و قەناعەتیان هەڵبژاردووە و تەنازولیان بۆ هیچ کاربەدەست و دەست رۆیشتووێك نەکردووە، بەڵکو دانیان بەخۆیاندا گرتووە و کەسایەتی خۆیان و رێزو حورمەتی زانستیشیان پارستووە، بۆنموونە: ئیمامی شافیعی خوالێی رازی بێ لە کۆپلە شیعرێکدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| رأيت القناعة رأس الغنى | فصرت بأذيالها متمسك |
| فلا ذا يراني على بابه | ولا ذا يران به منهمك |
| فصرت غنيا بلا درهمٍ | أمرُّ على الناس شبه الملك |

واتە: بینیم کەوا قەناعەت سەری دەوڵەمەندییە، بۆیە توند دەستەو دامێنی بووم و دەستم پێوەی گرت، نەئەو دەمبینێ لەبەر دەرگای بوەستم و نە ئەویش دەمبینێ بە دەوریدا بێم و بچم، بە هۆی قەناعەتەوە بەبێ زێڕ و زیو و پارە دەوڵەمەند بووم و پاشا ئاسا بەلای خەڵکی دا تێدەپەڕم و ئەڕۆم!.

حەوت: ماڵ و سامان بە هەر یەکێك لە مرۆڤی باوەڕدار و بێباوەڕ کافر ، هەروەها چاکەکار و خراپەکارەوە بەدەست دەهێندرێ و چنگ دەکەوێ، بەڵام زانیاری بەسود بە مرۆڤێکی باوەڕدار و خواناس نەبێ بە دەست ناهێندرێ.

هەشت: دەروون پاك دەبێتەوە بە کۆکردنەوەی زانیاری، رێزدار و شەرەفمەند دەبێت بە دەستخستنی، بەڵام هەرچی ماڵ و سامانە دەروون

پاك ناكاتەوە و تەواو (كامل)ی ناكات بەڵكو مرۆڤ، تا زیاتر لەگەڵی دا خەریك بێ و تێ بكۆشێ بۆی و كۆی بكاتەوە، زیاتر دەروونی گیرۆدەی ناتەواوی و چروكی و رەزیلی و تەواوی نەخۆشییە دەروونیەكان دەبێت، هەروەها سوربوون و خەریك بوونی دەروون لەسەر وەدەستهێنانی زانیاری هێمای رێك و پێكی تەواوی دەروونە، بەڵام ئەمەیان بۆ وەدەستهێنای سەروەت و سامان رێك نیشانەی ناتەواویەتی.

نۆ: هەروەها پارەو پوڵ و سەروەت و سامان خاوەنەكەی بانگ دەكات بۆ سەركەشی و لاساری و خۆ بەگەورەگرتن و فەخرو شانازی و فیزكردن بەسەر خەڵكی دا، بەڵام زانیاری بابای زانا بانگ دەكات بۆ بەسۆز و میهرەبانی و ملكەچی و هەستان بە راپەڕاندنی هەق و مافی بەندایەتی..

قوتابی بەڕێز:

ئەگەر سەرنجێكی هەڵسو كەوتی زانایان بدەیت زۆر بە روونی مەبەستی سەرەوەمان ئاشكرا دەبێ بۆ نموونە:..

دەگێڕنەوە جارێكیان پیاوێك لەگەڵ (الأحنف بن قيس)دا دەبێتە مشت و مڕی و بە (الأحنف) دەڵێ: ئەگەر قسەیەكم پێ بڵێی دە قسان دەبیستی! (الأحنف)یش دەڵێ: بەڵام ئەگەر تۆ دەقسەشم پێ بڵێی قسەیەكم لێ نابیستی.!

دە: خۆشەویستی زانیاری و داواكردنی بنچینە (أصل)ی هەمووی گوێڕایەڵی و فەرمانبەریەكە، بەڵام خۆشەویستیماڵ و سامان و بەدواداگەڕانی سەرچاوە و بنچینەی تێكڕای تاوان و خراپە و سەرپێچیيەكانە، بۆیە مرۆڤ ئەگەر ژیاننامە و مێژووی زانایان و قوتابیانی زانستە شەرعیەكان دەخوێنێتەوە ، رووداوی سەرسوڕهێنەر و بێ وێنە: لە بابەت هەوڵ و ماندوبوون و تامەزرۆییان بۆ بەدەستهێنانی زانست و زانیاری،

هەروەها خۆپاراستن و وەرع و پابەند بوونیان و ....هتد، بۆ وێنە:

أ- (جابر بن عبدالله) خوا لێی رازی بێ سەفەری کردووە بۆ وڵاتی شام، لە سەفەرەکەیدا یەك مانگ رێی بڕیوە تەنها بۆ بیستنی فەرموودەیەك لە (عبدالله بن أنس) کە ئەم فەرموودەی خوارەوە بوو کە ئەفەرمووێ: ((یحشـر الناس یوم القیامة حفاة عراة غرلا))[1].

ب- هەروەها ئیمامی بوخاری بۆ زۆر لە وڵاتان گەشت و سەفەری کردووە و بەدوای زانیاری دا گەڕاوە، زیاتر لە هەزار مامۆستا شتی بیستووە، عادەتی وابووە زۆر جاران لەخەو هەڵدەستایەوە و چراکەی پێدەکرد و شتێکی بەسود یانە مەسەلەیەکی پێویست، کە بە هزر و بیریا دەهات دەینووسیەوە پاشان دەخەوتەوە، چەندجار ئەمە دووبارە دەبوویەوە، بەڵکو شەوی وابووە بیست کەڕەت ئەمەی کردووە!.

ج- دەگێڕنەوە جارێکیان پیاوێك دەچێتە لای شێخ ئەحمەد زەهاوی لە فەرمانگەکەی خۆی، داوای لێ دەکات نامەیەك بۆ کەسێك بۆ بنووسێ، تاکو کارەکەی بە ئاسانی بڕوات! شێخیش کاغەزی لەلا نابێ، بۆیە فلسێکی دەداتێ و پێی دەڵێ: بڕۆ پەڕەکاغەزێك بکڕە، کابراش دەڵێ: شێخ ئەدی ئەوە کاغەزی سپی نیە لەبەر دەمت؟ ئەویش دەڵێ: رۆڵەگیان ئەوەماڵی دەوڵەتە و هی من نیە! جا کابرا دەچێ کاغەزێك دەکڕێ و بۆی دەهێنێ، ئەوجا نامەکەی بۆ دەنووسێ و بەپیر کارەکەی دەڕوات.

یازدە: بە زانیاری نەبێ کەس گوێڕایەڵی و فەرمانبەری خوای نەکردووە، کەچی تێکڕای ئەوانەی سەرپێچی و بێ فەرمانی خوا دەکەن بە ماڵ و سەروەت و سامانە.

---

[1] صحیح البخاري ٦٥٢٧ ، مسلم ٢٨٥٩

بەڵێ قوتابیئازیز:

بۆیە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێشینانی ئەم ئوممەتە زۆر جەختیان لەسەر هەوڵدان بۆ کۆکردنەوە و بەدەستهێنانی زانست و زانیاری کردووە، خەم ساردی و کەمتەرخەمی دەربارەی دەستخستنی زانستیان بەکارێکی مەترسیدار لە قەڵەم داوە بۆ وێنە:

(أبوبکر الغفاري) خوالێی رازی بێ فەرموویەتی: (یاجاهل العلم، تعلم العلم فإن قلبا لیس فیه شوق العلم کالبیت الخراب الذي لا عامر له)[1] واتە: ئەی نەخوێندەوار و بێ زانیاری هەوڵی فێربوونی زانیاری بدە، چونکە هەر دڵێك ئارەزووی زانیاری تێدا نەبێ وەك ماڵی خرابگە و کەلاوەشرەی بێ خاوەنی مشوور خۆر وایە !.

دوازدە: خاوەن ماڵ کاتێك بە باشی باسی دەکرێ و مەدحی دەکرێ، کە خەرجی بکات چرووکی پێ نەکات و نەیهێڵێتەوە، بەڵام تاك(فرد)ی زانا بە خۆپێ ڕازاندنەوە و کارپێکردنی و ڕەنگ دانەوەی لە هەڵس و کەوتی ڕۆژانەیدا.

سێزدە: ئەوەی پارەو پول و ماڵ و سامانی هەیە و دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتووە، ڕۆژگارێك دێ دەوڵەمەندیەکەی نامێنێ و لە کیسی دەچێ، بەمەش ئازارو خەفەت دەیگرێت و دڵتەنگ و نارەحەت دەبێت، بەڵام هەرچی دەست ڕۆیشتن و دەوڵەمەندی بە زانست و زانیاریە، بێگومان ئەمەی لەدەست ناچێ و دوو چاری خەفەت و دڵتەنگی دڵەڕاوکێ و نارەحەتیش نابێت ، هەروەها تام و چێژ (لذة) و خۆشی دەوڵەمەندی ماڵ و سامان حاڵەتێکی کاتیە و بە سەر دەچێ و دەبڕێتەوە خەفەت و دڵتەنگیشی لێ نەکەوێتەوە، کەچی تام و چێژ و خۆشی دەست ڕۆیشتن لە بواری زانست .

---

١ - من أقوال الصحابة والتابعين/ ص- ٢٨

شتێکی لەبن نەهاتوو بەردەوامە و هیــچ جۆرە ئـازار و خەفـەت و دڵتـەنگی و ناخۆشییێکی لیّ ناکەوێتەوە.

قوتابی ئازیز:

زانیـاری ئـەوەندە بـە بـەهاو جــێی گرنگــی و بایــەخ پێدانــی زانایـان و ڕێبوارانی ڕێی خواناسین بووە، بۆیە دەبینین بە جۆرەها شـێوەی قەشـەنگ وەسفیان کردووە ولێی دواون، بۆ نموونە:

(عبدالله بن داود) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ گوێم لە (سوفیانی ثـەوری) بوو دەیفەرموو: (إن هذا الحديث عز فمن أراد به الدنيـا وجدهـا، ومـن أراد بـه الآخرة وجدها)[1] واتـە: بەڕاسـتی ئـەم فەرمودەیـە شـکۆ و سـەربەرزییەکە، گەر کەسێك داوای دونیای پێ بکا بەدەستی دەهێنێ، هەروەها ئەوەی دواڕۆژ (الآخرة)یش پیّ داوا بکا بەدەستی دەهێنێ.

(سفيان بن عيينة)یش خوا لێی ڕازی بــێ دەفـەرمووێ: (أرفـع النـاس منزلة عند الله من كان بين الله وبين عباده وهم الأنبياء والعلماء)[2] واتـە: پلـە بەرزترینی خەڵکی لە لایەن خواوە، کەسێکە لەنێوان خـواو بـەندەکانی بێـت، ئەوانیش پێغەمبەران ــ عليهم الصلاة والسلام و زانایانن. شاعیریش ڕاستی گوتووە کە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ماالفخرُ إلا لأهلِ العلم إنهـــم | على الهدى لمن إستهدى أدلاّءُ |
| وقدر كل امرئ ماكان يحسنه | والجاهـلونَ لأهلِ العلمِ أعـداءُ |
| ففز بعلم تَعِشْ حيًّــا بهِ أبدًا | الناسُ مَوْتى وأهلُ العلمِ أحياءُ |

١ – البحر الرائق في الزهد والرقائق/ ص– ٣٨

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەڵێ قوتابی دڵسۆز:

ئەمەیە فەزڵ و قەدرو ڕێزی زانست و زیاد لە مەش بە پێی دید و هزر و بۆچوونی ئیسلامخوازان و زانست دۆستان ، خۆشویستنی زانیاری و كۆشش كردن بۆ مەبەستی بە دەست هێنانی زانیاری، بە خواپەرستی و دینداری لە قەڵەم دراوە و ئەژمار كراوە وەكو:

أ- پێشەوا (علی بن أبي طالب) خوا لێی رازی بێ- دەفەرمووێ: ( ومحبة العلم -أو العالم- دين يدان بها)[1].

ب - هەروەها دەربارەی فەزڵ و گەورەیی زانا گوتراوە: ( العالم بعد وفاته ميت وهو حي بين الناس) واتە: بابای زانا لە دوای مردنیدا، كە مردووە لە نێو خەڵكی هەر زیندووە، بەڵام نەزان، لە ژیانیدا كە ماوەو زیندووە كەچی لە نێو خەڵكی دا مردووە و كەس باسی ناكات وبیری لێ ناكاتەوە. بەراستی جوان و بە جێیە چونكە سەرنجێكی زانایانی فەرموودە ناسی(علماء الحديث) یان شەرع زانان(علماء الفقه) بدەین، دەبینین ساڵەهای ساڵە لە ژیاندا نەماون و ژێر گڵ كراون، كەچی مەدح و ستایش و باس و خواسیان دونیای پڕ كردوو، لە نێو خەڵكی چۆن هەر زیندوو لە ژیاندا بن ئاوان، بە تەنها لاشەو شێوەیان لە نێوماندا نەماوە، لەنێو دڵاندا زیندوون وەك دەڵێن: ( أعيانهم مفقودة وأمثالهم في القلوب موجودة).

ج- پێشەوا (علي بن أبي طالب) یش - خوالێی رازی بێ - لە لێكۆڵینەوەو توێژینەوەیەكی دەربارەی بەراوردییەك لە نێوان ماڵ و سامان و زانیاریدا دەفەرمووێ: ( وصنيعة المال تزول بزواله)[2] واتە: هەر دەستەكەوت و پلەو پایەو شتێك كەوا بە هۆی سامان و لە ڕێی ئەوەوە بە

---

١ - البحر الرائق في الزهد والرقائق/ ص-٣٦

٢ -البحر الرائق في الزهد والرقائق/ ص-٣٧

دەست بهێندرێ وەکو (خۆشەویستی ڕێز و تەقدیر ...هتــد)، بێگومـان لەبـەر خـاتری چـاوی کـاڵی سـامان دار نیـە، بـەڵکو هـی مــاڵ و سـامان و دەسـت ڕۆیشتنـەکەیەتی ، ڕاستەوخۆ دوا بەدوای نەمان و لەدەستدانی سامانەکە ئـەو ڕێز و خۆشەویسـتی و دۆسـتایەتی و چی‌یـەو چی‌یـەش نامێنــێ و لەدەسـت دەدرێ.

خوێنەری سەنگین :

ئەوەی ڕاستی بێ نەك تەنها ئەوەی سەرەوە سەرەنجامی دەوڵەمـەندی و سامانداری‌یە تەنانەت جاری وا هەیە ئەوەی تا دوێنێ خزمەتکار بوو ، بەڵێ و قوربان وەڵام گوفتار بوو ، نزیکەو لەوانەیە ئیمڕۆ، کە گۆڕانکاریـەك ڕوویـداوە لە گوزەرانی کاکی ساماندار سڵاویشی لێ نەکا و حسابیشـی بۆ نـەکات، وەك هەندێ لە عەرەبان لەم بارەیەوە گووتوویانە:

وكان بَنُو عمِّي يقولونَ مرحباً     فلما رأوني مُعسِراً مات مرحبُ

واتە: تا دوێنــێ ئامۆزایـەکانم سـڵاویان دەکـردوو دەیـان گـووت مەرحـەبا، بەڵام کاتێ باری ژیان و گوزەرانم گۆڕانی بەسەرداهات و بـە هـەژارییان بینیـم ئەو جار سڵاوو مەرحەبایەکەش نەماو سەری نایەوە.

کوردانیش جوانیان گوتووە، کە دەڵێن: ( تاکو گندۆر گندۆر بـوون دۆسـت و کەس گەلێك زۆر بوون، کە گندۆر هاتنــە قـڕان دۆسـت و کەسـیش نـەمان و بڕان).

# بەشی حەوتەم

## هەندێ ئاگاداری و وریاکردنەوەی پێویست.

**رێخۆشکردن:**

دیارە بێگومان رێگای بە دەستهێنانی زانیاری جۆرەها کۆسپ و تەگەرە و لەمپەر و گرفتی هەمە جۆری لە بەردەمە و راستەشەقامێکی بێ گرفت و گرێ و گۆلْ نیە، بۆیە بە پێویستمان زانی لەم بەشەی حەوتەمەدا هەندێ ئاگاداری و وریا کردنەوەی پێویست و زەروور بخەینە روو، هەرچەندە ئەو شتانەی کە مەترسیدار و زیانبەخشن بۆ سەر پرۆسەی زانستخوازی و لێ سڵەمینەوەو خۆلێ پاراستنیان گەرەکە، هەرچەندە زۆرن و لەم دەرفەتە کەمەدا ناتواندرێ هەژمار بکرێن و باس لە هەموویان بکرێن و گشتیان بخرێنە روو، بەڵام هەر چۆنێك بێت هەوڵدەدەین گرنگتریان بخەینە رووی ئێوەی بەرێز و سەنگین بە ئومێدی لێوە ئاگادار بوون و تێنەکەوتن و پێوەگرفتار نەبوونیان.

**یەك: قسەکردن بەبێ زانیاری و شارەزایی:**

بەراستی کارێکی یەکجار دزێوو مەترسیدار و نابەجێیە کەوا ئەهلی زانست چ وەك قوتابی و فێرخواز، یان مامۆستاو فێرکار، خۆی لە قەرەی باس و بابەت و مەسەلەیەك بدات، کە نایزانێ و شارەزایەکی ئەوتۆی لە بارەیەوە نیە و بانگێشەی زانایی بکات و دان نەنێت بە نەزانین و ناشارەزایی خۆیدا وەك ئەوەی پرسیاری لە بابەت هەر مەسەلەیەکەوە لێ بکرێت بێ دوو دڵی و سڵەمینەوە وەڵام بداتەوەو فەتوای قەبە قەبە دەر بکات! بێ گوێدانە مەرجی هەبوونی زانیاری شارەزایی لە بارەیەوە و پرسیارکردنیش لە کەسانی لە خۆی زاناتر و شارەزاتر، یان هاوئاستەکانی بەکەمی و ناتەواوی

بۆخۆی لێك بداتەوە، بەم هۆیەوە لەوانیش نەپرسێ و (شەلم کوێرم ناپارێزم) دروشمی بێ! چونکە ئەم خەسڵەت و خوە بەدوو ناقۆڵاو قێزەونە، هەم دەورو کاریگەریەکی نەگەتیف (سلبی) دەبێت لەسەر پرۆسەی خوێندن و نێو کۆمەڵ هەمیش لەلای پەروەردیگار، ئەم کارە دزێوە بە گوناح و تاوانێکی زل و زەبەلاح هەژمار دەکرێ خوا پەنامان بدات

خوێنەری ئازیز :

جا بۆ ئەوەی وریاتر و بەرچاو روونتربێت، وتەو هەڵوێستی بەشێك لە زانایانمان لەم بارەیە بۆ هەڵبژاردی:

(عبدالله بن مسعود وابن عباس) خوا لێیان رازی بێ فەرموویانە: (من أفتى الناس في كل مايسألونه عنه فهو مجنون)[1] واتە: هەرکەسێك فەتوا بدات بۆ هەموو ئەو شتانەی خەڵکی پرسیاری لێ دەکەن لە بارەیانەوە ئەوە شێتە و بەشێت لە قەڵەم ئەدرێ .

(أبو حصين الأسدي)یش رەحمەتی خوالێ بیێت دەڵێ: ( أن أحدهم ليفتي في المسألة، ولو وردت على عمر لجمع لها أهل بدر )[٢]. واتە: هی وا هەیە فەتوا لەبارەی مەسەلەیەك دەدات، گەر هێنرا بوایە بەردەم پێشەوا عومەر رەزای خوای لێ بێ هەموو ئەهلی بەدری بۆ کۆ ئەکردەوە ئینجا فەتواو بڕیارەکەی دەدا.

هەندێ لە زانایانیش گووتویانە: ( لا أدرى نصف العلم ) واتە: نازانم نیوەی زانست و زانیاری.

هەروەها زانای پایە بەرز ( أيوب ) –رەحمەتی خوای لێ بێت – ئەگەر یەکێك پرسیارێکی لێ دەکرد دەیگوت: ( أعد، فإن أعاد السؤال كما سأله عنه

---

١ – توجيهات ضرورية لطالب العلم/ ص– ٥٩

٢ – هەمان سەرچاوەی پێشوو.

أولاً أجابه، وإلا لم يجبه ) واته: دووبارەی بکەوە، ئینجا ئەگەر بە شێوەی جاری یەکەم دووبارەی بکردبایەوە وەڵامی دەدایەوە، ئەگینا بێدەنگ دەبوو وەڵامی نەدەدایەوە !.

بێگومان ئەم کارەی نیشانەی تێگەیشتوویی و زیرەکی و وریایی بووە، چونکە چەندەها کەڵك و سوودی ناوازە و نایابی پێوەیە بۆ وێنە:

پێشەوا ( ابن القیم ) رەحمەتی خوای لێ بێ لە کیتابە بەهێزو پێزەکەی ( اعلام الموقعین ) ٢/١٦٦، هەندێ کەڵك و سوودی ئەم کارەی خستوونەتە روو، لەمانە:

أ- مەسەلەکە بەم دووبارە کردنەوەیە زیاتر روون و ئاشکراتر دەبێت، بە هۆی چاك لێ حاڵی بوون لە ناوەڕۆکی پرسیارەکە.

ب- دەگونجێ پرسیار بێژ ( سائل) هەکە جۆرە کەم تەرخەمی و خەم و ساردیەکی لە پرسیار کردنەکەدا کردبێ، شتێکی وای پشت گوێ خستبێ و باس نەکردبێ کە بڕیارەکەی تەواو پێ بگۆڕێ، جا ئەگەر دووبارەی کردەوە روون دەبێتەوە و ئاشکرا دەبێت.

ج- جاری وایە وا ڕێك دەکەوێ بابای پرسیار لێکراو لە سەرەتاداو لە دەمی پرسیارکردنەکەدا بیری لای خۆی نیەو لە پرسیارەکە بێ ئاگایە و حاڵی نەبووە، بەڵام دوای دووبارە کردنەوەکە چاکتر گوێ دەگرێ و وشیار دەبێتەوە.

د- لەوانەیە بەمە ئاشکرا ببێ ، پرسیار بێژ چەواشەی کردبێ و مەسەلەکەی گۆڕیبێ زیادو کەمی تێدا کردووە، یان تەنیا سیناریۆیەکە دای رشتووە بۆ مەرامێك و لە واقیعدا ئەسلەن بوونیشی نیە، کە ئەو کات پێویست بە وەڵام دانەوەش ناکات[1].

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص/٥٩-٦٠

## دوو: هەوڵدان بۆ خۆ بە زاناو شارەزا ناساندن ونیشاندان:

قوتابی خۆشەویست:

دوور بکەوە و وریا بــە گــیرۆدەی دەردوو نەخۆشــی و ڤایرۆســی نــەداران و دەســت نەڕۆیشــتووانی بــواری زانیــاری نــەبیت و ڕێبــاز و ڕێگــای ئــەوان نەگریتەبەر بــۆ مــەرامی – خــۆ بە زانــا و شــارەزا ناســاندن و نیشــاندان– بە شێوەیەك هــەندێ بابــەت و مەســەلەی دیاریکراوی زانســتی ساز و ئامــادە و ئەزبەر(حفظ) بکەی هەر کە گەیشتی بە کۆڕ و مەجلیسێك و سێ چوار کەست بــە دەوری خۆتــەوە بینــی، دەســتبەجێ هــەوڵی ووروژاندنیــان بــدەی بــە مەبەست و مەرامی سەرەوە، چونکــە ئــەم کــارە تــابڵێی کارێکی ناشــیرین و نەنگ و ناڕێك و زیانبەخشە، بە تایبەت ئەگەر خــەڵکی حەقیقــەت و ماهیــەتت بزانێ!.

فێرخوازی بەڕێز و ڕەوشت بەرز:

بە درێژایی مێژوو بە پێی هەڵسەنگاندن و بەدوا داچوون و تاقی کردنــەوە دەرکەوتووە و ئاشکرا بووە ئەگەر دامان نا خەڵکانێك بۆ ماوەیــەکیش بتوانــن بە هۆی فریــودان و چەواشــەکردنی جــەماوەر بژیــن و مــەدار بکــەن، حەتمــەن ڕۆژێك دێ ئەم فریودان و چەواشەیەش نامێنێ و کۆتایی پێ دێت و دەمامکی ساختەکاری و درۆینــی لا دەچێــت و ڕووی حەقیقــەت و ســاغی و ڕاســتی بــۆ هــەموو لایــەك دەردەکــەوێ و ئاشــکرا دەبــێ جــا ئەگــەر بابــای فریــودەر لــە حەقیقەتەوە کەسێکی نەزان و کەم دەرامەت و نەدار بوو لە هەمبەر زانیــاریدا ، ئــەوا بــۆ هــەموو لایــەك ڕوون دەبێتــەوە و دەناســرێ و دەردەکــەوێ! لــە کۆنیشــەوە پێشــینان گوتوویانــە: ( تسـتطيع أن تخدع بعـض النـاس بعــض الوقت، ولكن لاتستطيع أن تخدع كـل النـاس كـل الوقـت ). واتــە: دەتوانیــت

ماوەیەك هەندێ خەڵكی فریو بدەی و فێڵیان لێ بکەی، بەڵام ناتوانیت هەموو کات فێڵ لە تێکڕای خەڵکی بکەی و چەواشەیان بکەی!.

## سێ: ترس و دڵەڕاوکێ لە هەمبەر هەنگاونان.

یەکێکی تریش لەو خوو خەسڵەتانەی، کە وەك کۆسپێکی ڕێگر لە بەردەم پێشڤەچوونی بواری زانیارییە شەرعیەکان تەماشا دەکرێ و پێویستە قوتابی خۆی لێ بوێرێ و دوورکەوێتەوە، بریتییە لە ( ترسان و بڕوا بە خۆ نەبوون لە هەنگاونان ) کە سەرەنجام زیانێکی یەکجار گەورە دەگەیەنێ بە زانستخوازان و ڕێبوارانی ڕێبازی زانیاری. ترسان لە هەنگاو نان و ڕەنج کێشان بۆ وەرگرتن و بەدەستهێنانی زانیاری یان زانستێك لە زانستەکان یان ترسان و نەوێران لە ڕاگەیاندنی وشەی ڕەوا.

چونکە خوێندکاری ڕەسەن دەبێ بوێر و چاونەترس بێ لە هەمبەر ئاستەنگ و کۆسپەکانی ڕێ و فەردێکی ئارامگر و خۆڕاگر و ڕێبوارێکی پشوودرێژ بێ.

هەڵبەتە کەسێکیش ژیان و بەسەرهاتی پێشینانی نەخوێندبێتەوە، کە چەند بە ئارام و خۆڕاگر و بە سەلیقە بوون لە پێناو وەدەستهێنانی زانست و زانیاری لە بەرامبەر دوژمنانی سوننەت و ستەمکار و زۆرداران و نەزان و نەفامان لێمان حاڵی نیە و چاك لە نیاز و مەبەستمان تێناگات!.

ئێمە دەتوانین ترس و نەوێرانی قوتابی دابەش بکەین بەسەر سێ قۆناغی جیا جیادا:

### ١- قۆناغی سەرەتایی:

بێگومان ئەوەی لەم قۆناغەدا قوتابی دەترسێنێ ولێی بۆتە تارمایی و مۆتەکە و دەترسێ سەرچاوەو پەڕتووکە گەورەو درێژەکانن لە تێکڕای بابەتا و زانستە جیاجیاکان..

ئەم ترسەش دەتواندرێ بنبڕ و ریشەکێش بکرێ لە رێگای خوێندنی سەرچاوە و کیتابە کورتەکان.

بۆ نموونە:

لە سەرەتادا قوتابی لەخوێندنی کیتابێکی وەکو (تفسیر القرآن العظیم إبن كثير) لە زانستی تەفسیر و (صحيح البخاری، صحيح مسلم) لە فەرموودە (جمع الجوامع) لە أصول الفقه ( ملا جامی ، البهجة المرضية) لە نحودا و(مغني المحتاج، تحفة) لە فیقهدا و ...تاد. دەترسێ، بەڵام دەتواندرێ ئەمە چارە بکرێ و رێگە چارەی بۆ دابندرێ بەم شێوەیەی خوارەوە:

لە پێشدا کیتاب و سەرچاوە کورتەکان لە تێکڕای زانستەکان بخوێندرێ وەکو: (زبدة التفسير من فتح القدير، جلالين بەبێ حاشیە-) لە زانستی تەفسیر (رياض الصالحين، بلوغ المرام) لە فەرموودە (الوجيز في أصول الفقه) و هتد .

## ٢- قۆناغی ناوەندی:

دیارە قوتابی زۆر جار دوای ئەوەی قۆناغێکی بڕی و ئاستێکی زانستی بەدەست هێنا و لە میانەی ئەم کارەی‌دا دوو چاری گرفتێکی تر دەبێتەوە کە بریتی‌یە لە ترسی لەبیرچوون. هەڵبەتە ئەم جۆرە ترسەش بە شوێن کەوتن و بە کرداری کردنی زانیاری بنەبڕ و چارە دەکرێ و قوتابی لێی رزگار دەبێ، وەك هەندێ زانایان لەم بارەیەوە فەرموویانە: (من أراد أن لاينسى الحديث فليعمل به) واتە: کەسێك بیەوێ فەرموودەی لەبیر نەچێتەوە با کاری پێ بکات!.

## ٣- قۆناغی کۆتایی:

لە کۆتایی رێگاو کات و زەمەنی کەوتنە سەرشانی ئەرکی ڕاگەیاندنیش دا فێرخواز دیسان گیرۆدەی ترس دەبێتەوە، ئەویش ترسانە لە ستەم و زۆری

زۆرداران و چاوسورکردنەوەکانیان، یان لە پلان و داوو تەڵەکەکانی خراپەکار و ئیبلیسەکانی جنۆکەو و ئادەمی ، بە وەپێشنان و پیشاندانی تەماعی دونیایی هەوڵدان بەمەرەمی گۆڕینی و لادانی..

فێرخوازی دامەزراو:

دەرمانی ئەم ترسەش تەنیا پشت بەستنە بەخوای مەزن و دڵۆڤان (التوكل على الله) و دامەزراوی‌یە وەك دەفەرمووێ: ﴿ فـأصدع بما تؤمر وأعرض عن الجاهلين, إنا كفيناك المستهزئين﴾[1].

لە کۆتاییدا دەڵێم:

حەقی خۆیەتی لە لایەن لایەنی پەیوەی‌ندار چاوێك بە میتۆد (المنهج) و پرۆگرامی ناوەندەکانی زانستەشەرعیەکان دابخشێندرێتەوە و دەستکاریەکی گونجاو و لە باری لەگەڵدا بکرێ بە شێوەیەك سەرلەنوێ بە شێوازێکی تازە و رێك و تۆکمەدا برژێندرێتەوە و چاکسازیەکی تەواوی تێدا بکرێ، تالەم هەل و مەرج و ئان و سات و سەردەمەی ئێستادا قوتابیانی ئەم ناوەندە زانستە شەرعیەش شان بەشانی سەرجەم ناوەند و مەڵبەندە زانستی و ئەکادیمیەکانی تر هەنگاو بنێن و دوانەکەوێ بە میتۆد (المنهج)ێکی گشتگیر و هەمەلایەن و لەبار و گونجاو پێ بنێنە گۆڕەپانی کار و چالاکی و گۆڕانکاری بەرچاو بخولقێنن و پلە و نمرەی چاك بەدەست بهێنن لە پێشڤە بردنی ئاستی زانیاری و پێشکەشکردنی خزمەتێکی فرە و هەمەجۆر بە گەل و نیشتمانیان، کە پێویستە لەم بەرنامە و پرۆگرامە نوێیەدا ئەم چەند خاڵەی خوارەوەی تێدا رەچاو بکرێن:

أ- سەرجەم زانستە شەرعیەکان وەکو: (تەفسیر و فەرموودە و زانستەکانی قورئان و فەموودەناسی و عەقیدە و فقە و هتد.) و زانستە

---

١ - الحجر/ ٩٤- ٩٥.

ئالیەکان وەکو: (نەحو و صەرف و بەلاغە و منطق و هتد.) وە زانستە هاوچەرخەکان وەك: (مێژو و ماتماتیك و گەردوون ناسی و سروشت ناسی و هتد.) لەخۆگرتبێ و گرینگیان پێ درابێ.

ب- سەرچاوە زانستیەکان بەپێی قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی و.تاد دابەش بکرێن، واتە: قۆناغبەندیان تێدا بکرێ چی تر بە سیستەمی هەڕەمەکی کار نەکرێ!.

ج- پێویستە گشت سەرچاوەکانی تێکڕای قۆناغەکان لە لایەن دەستەیەکی پسپۆر (المتخصص) هەڵبژێردرێن و دەستنیشان بکرێن و هاوکات لەگەڵ رەچاوکردنی هەڵبژاردنی سەرچاوەی پاك و ساغ و راست و بەڵگەدار ئاسان و شیاو.

د- هەروەها پێویستە چی تر بە نارەوا لە نێوان زانیاریە ئامرازەییەکان و شەرعیەکان هەدەف و وەسیلە تێکەڵ بەیەك بکرێن و بەجیا پێناسە بکرێن و خەڵکی تێدا سەرگەردان بکرێن و زانیاریە شەرعیەکان بە پەراوێز بکرێن!.

## چوار: زێدەڕۆیی لە شەرم و شەرمنی.

قوتابی وا هەیە ئەوەندە شەرمنە تەنانەت ناتوانێ و شەرم دەکات پرسیار لە مامۆستاکەی بکات، یان ئەرکی سەرشانی جێبەجێ بکات و زانیاریەکەی بە دەورویەر را بگەیێنێ!

بۆیە لەدەرئەنجامی ئەمەدا خۆی بێبەش دەکات لە زۆر بابەت و زانستی هەمەجۆر و بەر بلاو و زیانێکی فرەش لە خۆی دەدات..

پێغەمبەری رەوشت بەرزیش ﷺ لەم بارەیەوە نموونە بە ئافرەتانی ئەنصار دەهێنێتەوە، کە شەرم و حەیاو حەشمەت نەبۆتە رێگر لەبەردەم هەوڵدانیان بۆ شارەزایی پەیداکردن لە ئاینیان! وەك دەفەرمووێ: ((رحم الله

نساء الأنصار لم يمنعهن الحياء أن يتفقهن في دينهن))[1].

هەروەها (مجاهد)یش ـ رەحمەتی خوای لیٚ بێت ـ دەڵێ: (لايتعلم العلم مستح ولا مستكبر)[2] واتە: نە شەرمن و نە خۆ بە گەورەگر زانیاری فێر دەبێ.

خوێنەری بەرێز:

وریا بە بەهەڵە لە مەسەلەکە حاڵی نەبی ئێمە، کە باس لە شەرم و حەیا دەکەین ئەوە ناگەیەنێ کە شەرم و حەیا بە شێوەیەکی گشتی کارێکی سەلبییە و ئەبێ خۆی لیٚ دوورە پەرێز بگری،نا، نەخێر ئێمە ئەوەمان گەرەك نیە، بەڵکو ئێمە مەبەستمان ئەو جۆرە شەرم وشەرمنییە، کە لە سنوورو چوارچێوەی شەرعی و سروشتی خۆی تەجاوز دەکات و دەترازێ و دەرئەنجامێکی خراپ و نەخواستاراوی لیٚ ئەکەوێتەوە و زیان بە فێرخواز دەگەیێنێ!.

(إبن القيم) رەحمەتی خوای لیٚ بێت گوتوویەتی: (وللعلم ست مراتب: أولها حسن السؤال، الثانية: حسن الأنصات و الأستماع، الثالث: حسن الفهم، الرابعة: الحفظ، الخامسة: التعليم، السادسة: وهي ثمرته، العمل به ومراعاة حدوده)[3] واتە: زانیاری شەش پلەی هەیە: یەکەم جوان پرسیارکردن، دووەم: بەرێکی گوێلیٚ گرتن و خۆ بێ دەنگ کردن، سێیەم: چاك تێگەیشتن، چوارەم: لەبەرکردن، پێنجەم فێرکردن، شەشەم، ئەمەیان بریتییە لە بەرهەمەکەی کە کارپێ کردن و چاوەدێری و پاراستنی سنوورەکانیەتی بێگومان پلەی یەکەم و دووەم بەراشکاوی تەواو ئاماژە بە پابەندبوون بە ئەدەب و شەرم و حەیاوە دەکەن.

---

١ - رواه البخاري.

٢ - الجامع في طلب علم الشريف/ص- ١٨٨

٣ - توجيهات ضرورية لطالب العلم، من (مفتاح دار السعادة/ ص-١٨٤).

## پێنج: پەلەکردن لە فتوادان و کیتاب دانان.

پێویستە قوتابی پەلەنەکات لە فتوادان و نووسین و کیتاب دانان، بەڵکو زەرورە بەر لەوەی بەم کارە هەستێ هەوڵ و تەقەلا بدات و رەنج بکێشێت بۆ خۆپێگەیاندن و ساز و ئامادەکردن بە مەبەست و مەرامی هەستان بەم کارە قورس و پڕ مەسئولیەتە و بەدەستهێنان و نیشاندانی توانست و لێ هاتوویی و شایستەیی خۆی!.

چونکە ئەنجامدانی ئەم کارە هەم لەباربردنی هزر و بیر و توانست و توانایە، کە پێش هاتنە بەرهەم و پێگەیشتنی، کە هەندێ لە زانایان بە (الأجهاض الفکري) ناوزەدی دەکەن، هەمیش خۆ کوناهبارکردن و تاوانبار کردنە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ((من أفتي بغير علم، كان إثمه على من أفتاه))[1] واتە: کەسێك فەتوای بە هەڵە و بێ زانیاری بۆ بدرێ تاوانەکەی لەسەر ئەو کەسەیە کە فەتواکەی بۆ داوە.

ئیمامی (مالك)یش ـ رەحمەتی خوای لێ بێت ـ گوتوویەتی: (من سئل عن مسألة فينبغي له قبل أن يجيب فيها أن يعرض نفسه على الجنة والنار، وكيف يكون خلاصه في الآخرة ثم يجيب فيها)[2] واتە: گەر کەسێك لە بارەی مەسەلەیەکەوە پرسیاری لێ کرا ، پێویستە بەر لەوەی وەڵام بداتەوە بەهەشت و دۆزەخ و چۆنیەتی خەلاس بوون لە دوارۆژ بهێنێتە بەرچاوی، ئینجا پاش ئەمە وەڵام بداتەوە ! ؟.

١ - رواه أبو داود عن أبي هريرة بإسناد حسن.

٢ - الجامع في طاب علم الشريف/ص-٢٢٢، ( اعلام الموقعين/ح٤ ص-٢١٨)

## شەش: هەڵە و کەم و کورتی زانایان کردنە بیانوو پاساو:

پێویستە بابای فێرخواز کاتێ کەم و کوڕی و ناتەواوی، یان بۆچوونێکی هەڵە و سەهو ساتمەکردنی زانا و پێشەوایانی ئیسلامی بەرچاو دەکەوێ، بەمە دڵخۆش و خۆشحاڵ نەبێت و نەیکات بە بیانوو پاساو بۆ خۆی و دڵی خۆی بەمە نەداتەوە!.

چونکە بەڵگە هێنانەوە بە هەڵخلیسکان و ساتمەکردنی زانایان تا بڵێی کارێکی هەڵە و نادروست و نابەجێیە، چونکە زانا و چاوساغ و پێشەوایانی ئیسلامیش وەك هەر تاکێکی تری کۆمەڵگا مرۆڤن، دەگونجێ هەڵە و کەم و کورتی و ناتەواویان هەبێ و دوچاری هەڵەی زانستی و کرداری (العلمي والعملي) ببن، وەك پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دەفەرمووێ: ((کل بني آدم خطـاء وخير الخطائين التوابون))[1] واتە: تێکڕای ئادەمیزادەکان هەڵەکارن و چاکترین هەڵەکارانیش تۆبەکارانن کەواتە نابێ و ناگونجێ کەس بەبێ هەڵە تێبگەین و چاوەڕوانی بێ هەڵەیی و ناتەواوی لەهیچ مرۆڤێك بکەین و کەس بە (معصوم) بزانین.

(ذوالنون المصري) دەربارەی ئەوانەی بەڵگە بە هەڵە و پەڵەکانی زانایان دەهێننەوە و لە راستەشەقام لادەدەن گوتوویەتی: (جعلوا قليل زلات السلف حجة أنفسهم، ودفنوا كثير مناقبهم)٢ واتە: کەمێك لە هەڵە و ساتمەکردنەکانی زانایانیان کردووەتە بەڵگەی خۆیان، کەچی زۆرێك لە چاکە و پیاوەتی و جوامێرییان شاردۆتەوە و باسیشیان ناکەن!.

---

١ - خرجه الترمذي وابن ماجه.

٢ - توجيهات ضرورية لطالب العلم/ص- ٦٢

خوێندکاری بەڕێز:

زەرورە تۆ وەکو قوتابیەکی – زانستە شەرعیەکان    لە بەرامبەر هەڵە و ناتەواویەکانی زانایان هەڵسو کەوت بکەی و هەڵوێست دەربڕی و ویژدان بکەیتە سەنگی مەحەك و بەکاری بێنی، تاکو هەرزەکارانە و ئارەزومەندانە بڕیار دەرنەکەی و بەهەڵەدا نەچی!.

جا ئێمە وەکو هاریکارکردنێك و یارمەتی دانێك چەند ڕێنمایەکت لەم بارەیەوە پێشکەش دەکەین، تاکو بەرچاو رونانەتر و ژیرانەتر لە هەمبەر ئەم مەسەلەیەدا هەڵس و کەوت بکەی و هەڵویستی راست و دروست و بەجێ هەڵبژێری:

١– تاکە مەبەست و پاڵنەرت بۆ وروژاندنی هەڵە و هەڵخلیسکانەکە راستکردنەوەی مەسەلەکە بێت و بەس،مەرام و مەبەستی تری لە پشتەوە نەبێ و حەشار نەدرابێ.

٢– پێویستە هەڵە و گۆڕین و لادان (إنحراف) تێکەڵ بە یەکتر نەکرێن و لە یەکتر جیا بکرێنەوە و نەخرێنە تای تەرازوویەکەوە، چونکە هەندێ هەڵەو ساتمەکردن جێی ئومێدی و لێخۆشبوون و لێبووردنن بەو پێیەی، کە ئەنجامدەرەکەی تەواو راستی و رەوایی مەسەلەکەی لە لا روون و ئاشکرا نیە و کەمترخەمی و ساختەیی تێدا نەکردووە، بەڵام هەرچەندی لادان و خۆ گۆڕینە بە تاوان و جەریمەیەکی زل لە قەڵەم ئەدرێ و قابیلی چاوپۆشی لێکردن و لێبووردن نیە، چونکە بابای لاڕێ(منحرف) لایەنی راستییەکە دەرك دەکاو دەیناسێ، کەچی لێی لادەداو پەنا دەباتە بەر بەڵگەو پاساوی لاواز و پێچەوانەو دژ لە گەڵ بەڵگەی بەهێز و راست و بەجێ بۆ مەرامی تایبەتی خۆی و بێ پەروا مومارەسەی دەکات!

٣- هەر کاتێك شتێکت بۆ ساغ بووەوە، کە ئەمە هەڵخلیسکانە، یان بۆچوونێکی هەڵەیە، یان لاوازە یان فەتوایەکی بێ بەڵگەیە لە لایەن زاناو پێشەوایانەوە، پێویستە دەسبەجێ و بێ دوو دڵی و راوەستان پشتی تێبکەی و کاری پێ نەکەی، چونکە هەر ئەم هەڵوێست و رەفتارە دەستەبەری ئەوەیە دووچاری ڤایرۆسی لادان و هەڵخلیسکان و ساتمە کردن نەبیت.

لە کۆتاییدا دەڵێم:

فێرخوازی ژیر و لێزان و بێدار و بە ویژدان ئەو فێرخوازەیە، کە هیچ کات هەڵەو کەم و کورتی زانا و پێشەوایانی پسپۆری بوارێك لە بوارەکان ناکاتە پاساو و ئاستەنگ نە بۆ لادان و هەڵەکارییەکانی خۆی، نە بۆ کەڵك و بەهرە وەرنەگرتن لە بەرهەم و کەلەپوور و چاکەو خێری زاناو پێشەوایان، بەڵکو رێك بە پێی ئەم بنەماو پرەنسیپە تەعامول دەکا کە دەڵێ: (( خذ ماصفا ، دع ما كَدَرَ )) واتە: ئەوەی ساف و ساغ و دیار و روونە بیگرەو دەستە بەری بکە، واز بێنە لەوەی کە شلوێ و لێڵە !.

هەروەها بەهۆی هەڵەو کەم و کورتیەکانەوە کاریان بەکەم نەزانێ و تۆمەت و پڕو پاگەندەی جۆراوجۆریان ناخاتە پاڵ و بۆ هەڵنابەستێ و پەلە ناکات لە حوکم دان بەسەریانەوە، بەڵکو تا بۆی بکرێ و بلوێ رێی تێ بچێ عوزر و پاساویشیان بۆ دەهێنێتەوە، قەناعەتیشی بەم حەقیقەتە هەیە کە دەڵێت:(( من فضائل الرجال أن تُعَدَّ معايُبُهُمْ )) واتە: لە چاکەو جوامێری پیاوان ئەوەیە کە عەیب و هەڵەکانیان بژمێردرێن.

## حەوت: بە وەرگرتنی کەمە شارەزایی و زانیارییەك قەناعەتکردن.

یەکێکی تریش لەوانەی کە پێویستە زانستخوازان خۆی لیٚ دوور بگرن و لە خۆی نەوەشێننەوە و نزیکی نەکەون، قەناعەتکردنە بە بە وەرگرتنی کەمە شارەزایی و زانیاریەك، نابێ قوتابی هەر کە بڕە زانیاریەکی بەدەست هێنا، یان بڕوانامەیەکی زانستی وەرگرت، ئیدی دوای ئەمە پالّی لیٚ بداتەوەو چی تر نەگەڕێ و داوای زانیاری پتر نەکات، بەبیانووی ئەوەی گوایە بەو بڕە زانیاریە بەڕی خۆی لە ئاوێ دەردێنێ و ئەوەندەی بەسە و پێویستی بە چی تر نیە، ئیتر هەولّدان و بەردەوام بوونی زیاتری بۆ چییە!

بەلاّم ئەوەی راستی بێ هەر فەردێك بەم شێوەیە بیر بکاتەوە تابلّێی هەلّەیە و لە بیرکرنەوەکەیدا ساتمەی کردووە، چونکە هەمومان دەزانین کە پێغەمبەر ﷺ سەرەڕای هەبوونی پلەی بەرزی پێغەمبەرایەتی لە بواری زانیاریش لە چلەپۆپە و لووتکەی هەرە بەرز دا بووە، کەچی هێشتاش خوای پەروەردیگار پیٚی ئەفەرمووێ: ﴿وَقُل ربِّ زدني علماً﴾[1] واتە: بلّێ: پەروەردیگارم زانیاریم بۆ زیاد بکە.

دیارە وەك دەلّێن: زانست دەریایەکی بێ بنەو سەرەتای هەیە، بەلاّم کۆتایی نیەو بێ کۆتایە! پێغەمبەری سەروەریش ﷺ فەرموویەتی: ((منهومان لا يشبعان: طالبُ علمٍ وَطالِبُ دُنيا))[2]. واتە: دوو ئارەزوومەند تێر نابن: داواکاری زانست و داواکاری دونیا.

( إبن عبد البر) گوتوویەتی: (قتادة) فەرموویەتی: ( لو كان أحدٌ يكتفي من العلم بشئ لاكتفى موسى– عليه السلام– ولكنه قال: ﴿ هل أتبعك على أن

---

١ –طه/١١٤

٢ – رواه البزار وصححه الألباني في ( صحيح الجامع ) ج٥/ص–٣٧٤.

تعلمني مما عُلّمتَ رُشداً﴾[1].

خوێنەری ئازیز:

ئینجا ئەگەر سەرنجی قسە و گوفتار و حاڵ و چۆنیەتی هەڵس و کەوتی هەندێ لەزانایان بدەی لە بارەی ئارەزوومەندی و بەردەوامبوون و هەوڵدانیان بۆ وەدەست هێنان و دەست خستنی زانیاری، سەرسام دەبیت و واقت وڕدەمێنێ! بۆ نموونە:

أ- (ثعلب) کە زانایەکی پسپۆڕی زمانی عەربی‌یە لە بارەی ( إبراهیم الحربی) دەڵێ: (( مافقدتُ إبراهیم الحربي من مجلسِ نحوٍ أو لُغةٍ خمسین سنة))[2] واتە: ماوەی پەنجا ساڵ دەبێ هیچ کۆڕێکی ڕێزمان یان زمانی عەرەبی نەبووەو نەم بینیوە کە (إبراهیم الحربي ) تێدا بەشدار و ئامادە نەبێ.

ب- جارێك پرسیاریان لە ( عبدالله بن المبارك المروزی) کرد: ئەگەر دوای مردن زیندوو کرابایەوە چیت دەکرد؟ لە وەڵامدا گوتی: ( أطلبُ العلم حتى یأتیني ملك الموت ثانیةً)[3] واتە: دوای زانیاری دەکەوتم تا بۆ جاری دووەم فریشتەی گیان (ڕوح) کێشان دەهاتەوە لام.

ج- (أبو زرعة) گوتوویەتی: ( کان أحمد بن حنبل یحفظ ألف ألف حدیثاً )[4] واتە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل- ڕەحمەتی خوای لێ بێ- هەزار هەزار فەرموودەی لەبەر بوو- واتە ملیونێك -!.

---

١ - الجامع في طلب علم الشريف/ص-١٨٢، من جامع بيان العلم/ج١-ص ٩٥-١٠٠

٢ - معالم في طريق طلب العلم/ص-٢٨١

٣ - هەمان سەرچاوەی پێشوو/ص- ٢٨٠

٤ - توجيهات ضرورية لطالب العلم/ص-١٤، من صفة الصفوة ٣٣٧/٢

د- (سليمان بن شعبة)يش گوتوويەتی: ( كتبوا عن أبي داود  أربعين ألف حديث، وليس معه كتاب)[1] واتە: ئەبوداود  بێ ئەوەی كيتابی پێ بێ چل هەزار فەرموودەيان لێيەوە نووسیيەوە !.

هـ- هەروەها گوتراويشە: (( العلم ثلاثة أشبار، من دخل في الشبر الأول تكبر ، ومن دخل في الشبر الثاني تواضع، ومن دخل في  الشبر الثالث علم أنه مايعلم ))[2] واتە: زانياری سێ بستە، ئەو كەسەی چووە نێو بستی يەكەم خۆی بە گەورە گرت، ئەوەی چووە نێو بستی دووەم بێ فيز بوو، ئەوەی چووە نێو بستی سێيەم زانی كەوا هيچ نازانێ!.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

وصل اللهم على محمد النبي الأمي، وعلى آله وصحبه وسلم

٢٠ / جمادي الثانية / ١٤٢٣ ك

٢٩/ ئاب / ٢٠٠٢ ز

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو/ ص- ١٥

٢ - حلية طالب العلم/ ص- ٥٧

# ناوەڕۆك

پێشكەش بێ ........................................................ ٥
پێشەكی ........................................................ ٧
ڕێ خۆشكردن ........................................................ ١١

## بەشی یەكەم

**چەند خەسڵەت و ڕەوشتێكی پەیوەندی دار بە خودی خوێندكار** ........................ ١٥
١- زانست بەخواپەرستی دانان: ........................................ ١٥
أ- بەس خودا مەبەست بوون ( الاخلاص ) : ........................ ١٦
ب - پێكان و بەپێی شەرع بوون ( الصواب ) : ........................ ١٦
٢-ترسان لە خوا ﷻ : ........................................ ١٧
أ- كورتە ترس ـ الخوف القاصر ........................................ ١٨
ب - زێدە ڕۆیی لەترس ـ الإفراط في الخوف ـ : ........................ ١٨
ج -ترسانی مام ناوەندی: ........................................ ١٩
٣- هەست كردن بەچاودێری خوا ﷻ : ........................................ ١٩
٤ـ دونیا بەكەم سەیر كردن ـ الزهد ـ : ........................................ ٢٠
٥- خۆ بە كەم گرتن و بێ فیزی : ........................................ ٢٢
٦- بە ئارامی و خۆڕاگری: ........................................ ٢٤
٧- نەرم و نیانی ( الرفق ) : ........................................ ٢٦
٨- چاوپۆشی و لێبووردەیی : ........................................ ٢٧
٩- زوو تووڕە نەبوون و بە حەوسەلەیی: ........................................ ٢٩
١٠- بۆ ئیسلام بە پەرۆش و خەمخۆرو دڵسۆزبوون: ........................................ ٣٠
١١- پابەند بوون بە كیتاب و سوننەتەوە: ........................................ ٣١

## بەشی دووەم

**چەند ڕەوشت و خەسڵەتێكی پەیوەندیدار بە ژیانی زانستیی قوتابی** ........................ ٣٣
١- هیممەت بەرزی ........................................ ٣٣
٢-ئەمانەتی زانستیی........................................ ٣٥
٣-ڕاستگۆیی (الصدق)........................................ ٣٧

٤–پەنا بردن بۆ لای خوا لەزانست خوازیدا........................ ٤١
٥–گەشتی زانستیی:............................................ ٤٢
٦– پاراستن و پارێزگاری کردنی زانیاری:.......................... ٤٤
٧–زانیاری پاراستن بە نووسینەوە:............................... ٤٧
٨– پێداچوونەوەو بەسەرکردنەوەی دەرخکراو( المحفوظات )ەکان:.............. ٤٩
٩–بە فیڕۆنەدانی کات و پارێزگاری کردنی ساتەکانی تەمەن ................. ٥٠

**بەشی سێیەم**

**بەکار هێنان و بەکرداری کردنی زانست** ...................... ٥٥
١–دەرك کردنی نیشانەکانی زانستی بەسود ............................ ٥٥
٢– زەکاتی زانستەکەت بدە ...................................... ٥٦
٣– عیززەت و سەربەرزی زانایان..................................... ٥٨
٤– لە هەوڵی پارستنی زانستدا بوون نەك پارێز لە پلە و پایە ............. ٦٧
٥– پەرتوکخانەکەت ............................................. ٦٨
یەك: بیرو باوەڕ ................................................ ٧١
دوو: بواری خواپەرستی و بەندایەتی خوا .............................. ٧١
سێ: بواری خووڕەوشت ............................................ ٧٢
چوار: لایەنی شێوەو دیمەن رواڵەت.................................... ٧٤

**بەشی چوارەم**

**چاودێری کردن و ڕاگرتنی ڕێزو حورمەتی مامۆستا**......................... ٧٧
هەڵس و کەوتی پێشینانمان لە ئاقار مامۆستایان دا:......................... ٨١
چەند رێنمایەکی پێویست ........................................ ٨١
یەکەم: هەڵبژاردنی کەسێکی شیاو بۆ خۆی بە سیفەتی مامۆستایەتی ....... ٨١
دووەم: فێرخواز نابێ خۆبەگەورەگر بێ .................................. ٨٢
سێیەم: مامۆستاکەت چاکترین و لەبارترین پێشەنگێکە بۆتۆ.................. ٨٢
چوارەم: بە دەست هێنانی بە تەنگەوە بوون و بە مشووری مامۆستا ........ ٨٣
پێنجەم: تۆمارکردن و نووسینەوەی هەندێ بابەت و شتی پێویست ......... ٨٤

## بەشی پێنجەم

**هەڵس و کەوتی قوتابی زانستیەشەرعیەکان لە نێو قوتابخانەدا..............٨٥**

یەك: گوێڕایەڵی براگەورە (الأمير).............................................٨٥

دوو: ڕەچاوکردنی گەورە و بچووکیی ........................................ ٨٧

١- لایەنی زانیاری ........................................................... ٨٧

٢- بارو لایەنی تەقوا و پاریزکاری............................................ ٨٨

٣- باری ژیریی و هۆشمەندی................................................ ٨٨

٤- ڕەوشت و ئاکار بەرزی ................................................... ٨٨

٥- تەمەنداریی................................................................٨٩

سێ: بایەخدان بە پاك و خاوێنی..............................................٨٩

١- لایەنی دڵ ودەروونی.................................................... ٩٠

٢- پاك ڕاگرتنی زمانی ....................................................... ٩١

٣- دەم ........,................................................................ ٩١

٤- جەستە (الجسد).......................................................... ٩٢

٥- قوتابخانە ....................................................................٩٣

چوار: دوانەکەوتن لەکاتی نوێژەکان و دەرس خوێندن و......................٩٣

پێنج: پاراستنی کتێب و خراپ و بێسەر و بەر نەکردنی: ...................... ٩٤

شەش: هەڵس وکەوت و ڕەفتارکردن لەگەڵ میواندا.........................٩٥

١- پێشوازی کردن: ..........................................................٩٦

٢- ڕووخۆشی و گوفتار شیرینی:..............................................٩٦

٣- تەوقە کردن:..................................................................٩٧

٤- لە لای سەرەوە دانیشتاندنی:..............................................٩٧

٥- خواردن و خواردنەوە پێدانی: ..............................................٩٧

٦- بە تەنیا بە جێ نەهێشتنی: ................................................٩٨

٧- گڵ نەڕەنجاندن و سەغڵەت نەکردنی بە هۆی قسە و پرسیاری نابەجێ:.٩٨

٨- بەڕێزەوە بەڕێکردنـــی:.......................................................٩٨

حەوت: ڕەفتار کردن لە گەڵ هاوەڵ و برادەردا: ................................٩٩

هەشت: ڕەوشتی خواردن و خواردنەوە و خەوتن و لەخەو هەستان. .......... ١٠٢
یەك: خواردن و خواردنەوە .......................... ١٠٢
٢- بەدەستی ڕاست خواردن.......................... ١٠٣
٣- لەبەردەم خۆ خواردن و دەست درێژ نەکرن بۆ ئەم لاو ئەولای.......... ١٠٣
٤- عەیب و ڕەخنە نەگرتن لە خواردن .......................... ١٠٣
٥- پاڵنەدانەوە لەکاتی خواردن .......................... ١٠٤
٦- دەست شوشتن و... دوعای کۆتایی خوێندن.......................... ١٠٤
٧- ئەدەب و ڕەوشتی ئاوخواردنەوە.......................... ١٠٤
دوو: خەوتن و لەخەو هەستان.......................... ١٠٦
سێ: ڕەوشتی ئیزن وەرگرتن (الأستئذان) .......................... ١٠٧
چوار: ئەدەب و ڕەوشتی پژمین و باوێشك.......................... ١٠٨
پێنج: ڕەوشتی قسەکردن.......................... ١٠٩


## بەشی شەشەم


ئایا زانست لەگەڵ پارە و پوول و سامان بەراورد دەکرێ؟ .......................... ١١٣


## بەشی حەوتەم


هەندێ ئاگاداری و وریاکردنەوەی پێویست. .......................... ١٢٣
یەك: قسەکردن بەبێ زانیاری و شارەزایی:.......................... ١٢٣
دوو: هەوڵدان بۆ خۆ بە زاناو شارەزا ناساندن ونیشاندان: .......................... ١٢٦
سێ: ترس و دڵەڕاوکێ لە هەمبەر هەنگاونان. .......................... ١٢٧
١- قۆناغی سەرەتایی .......................... ١٢٧
٢- قۆناغی ناوەندی .......................... ١٢٨
٣- قۆناغی کۆتایی .......................... ١٢٨
چوار: زێدەڕۆیی لە شەرم و شەرمنی. .......................... ١٣٠
پێنج: پەلەکردن لە فتوادان و کیتاب دانان.......................... ١٣٢
شەش: هەڵە و کەم و کورتی زانایان کردنە بیانوو پاساو:.......................... ١٣٣
حەوت: بە وەرگرتنی کەمە شارەزایی و زانیارییەك قەناعەتکردن. .......................... ١٣٦
ناوەڕۆك.......................... ١٣٩